د. جەمال ڕەشید ئەحمەد

# کەرکووک لە چەرخە کۆنەکاندا

(کۆمەڵە سەرنجێ سەبارەت بە مێژووی کەرکووک)

وەرگێڕانی

حەسەن جاف

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **کەرکووک لە چەرخە کۆنەکاندا لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی مێژووی کەرکووک**
- **نووسینی:** د. جەمال رەشید ئەحمەد
- **وەرگێڕانی:** حەسەن جاف
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **پیتچنین:** محەمەد مامەند
- **بەرگ:** هۆگر صدیق
- **ژمارەی سپاردن:** ١٦٢٥
- **نرخ**
- **چاپی یەکەم** ٢٠٠٨
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆک)

**زنجیرەی کتێب (٣٢٣)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێشەکی

کەرکووك شارێکی کۆنە و دەکەوێتە ناوچەی زورگی باکووری زنجیرە چیاکانی حەمرین کە وڵاتی عەرەب لە کوردستان جیا دەکاتەوە و (٢٩٠) کیلۆمەتریش لە باکووری بەغدای پایتەخی عیراقەوەیە.

لە ئەنجامی ئەو توێژینەوانەی لە ناوچەکانی دەوروبەری ئەم شارەدا کراوە، لەسەر شوێنەواری گوندە میزولیسیەکان (القری المیزولیثیە) -قۆناغی نێوان هەردوو چەرخی بەردینی ناوەند و کۆن وەك گوندی کەریم شەهر- هەروەها نیولیسیەکانیش (النیولیثیة) -چەرخی بەردینی نوێ وەك گوندی چەرمو-.

لەم دوو قۆناغەدا مرۆڤ دوا بە دوای رۆژگاری شۆڕشی کشتوکاڵی لە باکووری بەرزاییەکانیەوە، چووە قۆناغی ژیانی نیشتەجێ بوون و سەقامگیری، ئەم ماوەیەش دەکەوێتە نێوان هەزارەی دەیەم و پێنجەمی پێش زایینن کە خەڵکی بە درێژایی ئەم ماوەیە پشتیان بە باران دەبەست بۆ بەرهەم هێنانی پێویستییەکانی ژیان، ئەمەش دوای ئەوەی گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی بەسەر هۆیەکانی ژیانیدا هات، لە راووشکارەوە بۆ کشتوکاڵ.

هێڵی روونکردنەوە -الخط البیانی- بۆ جێگۆرکێی ئەم مرۆڤە لەم بەرزاییانەوە بەرەو دەشتاییەکان بەتایبەتی لە کۆتایی چەرخی ژیاری -حضارة- ((تل حلف)) لە (ناوەڕاستی هەزارەی پێنجەمی پێش زایین) ئاماژە بەوە دەکا کە چیا و ئەشکەوتەکانی بەجێهێشتووە و لە ناوچە بەرزەکانەوە هاتووە بەرەو ناوچەکانی خوارووتر، دوای ئەوەی بە هۆی نیشتنی قوڕ و لیتەی هەردوو رووبارە مەزنەکەی دیجلە و فورات و لقە زۆرەکانیان وەك هەردوو زێ -زاب- و دیالە و خابور، لەو ناوچانەدا دۆخی لەبارتر پەیدا بوو بۆ هۆیەکانی بەرهەم هێنانی کشتوکاڵی.

دوای ئەوە لەو شوێنی نیشتەجێیە پێشکەوتووانەی سەردەمی برونزی و لە ڕۆخی ئەم ڕوبارانەدا پشکنین کرا، بۆ پسپۆڕانی زانستی ئارکیۆلۆجیا -شوێنەوار- ڕوون بووە کە خەڵکانێك پێش سەردەمی نووسین لەم نیشتەجێیانەدا -مستوطنات- بوون، هەر ئەوانیش ڕێیان خۆشکرد بۆ دروست کردنی شار لە بەشەکانی خوارووداو ژیاری ناوخۆیی خۆیان بنیات نا بە پشت بەستن بە پێشینەی ژیاریی باپیرانیان لە باکوور.

سەردەمی گەیشتنی هۆزە ڕەوەندەکانی -البدویە- سامیەکان و هیند و ئەوروپییەکان بۆ دۆڵی دوو ڕووبارەکە دەکەوێتە پێش ئەم قۆناغەوە.

سەرەڕای هۆیە ئابوورییەکان و پێویستی بۆ زەویی تەختانیی بە پیتی کشتوکاڵ، دروستکردنی ئەو شارە کۆنە بێ شورایانەی لە باشووردا دروستکران، بەپێی بۆچوونی پاشاکانی شارۆچکەکان -ملوك الدویلات- پشتیان بە کۆمەڵی بڕوای ڕۆحی سەرەتایی دەبەست، جا یان ئەوە بوو کە ئەم پشت بەستنە جێبەجێ کردنی فەرمانی خواوەندەکان بوو -وەك خۆیان دەیانگوت-، ئەمەشیان لەسەر حیسابی ڕۆڵەکانی چینە ژێردەستەکانی کۆمەڵ هێنایە دی و دیارترین دیاردە سەرەتاییەکانیشی بریتی بوو لە بنیات نانی ((زقورە))کان کە ماڵی ئەو خواوەندانەی تێیدابوو.

یانیش مەبەست لە بنیات نانی قەڵا و شوراکانی باکوور بۆ ئەوە بوو هۆیەکانی ژیانی دانیشتووانی تێیدا کۆبکەنەوە، لەگەڵ وەدەس خستنی هۆیەکانی خۆپاراستن.

بەمجۆرە دانیشتوانی گوندە کۆنەکان وەك چەرمووکانی سوور و مەتتارە لە کەرکووکدا، لەسەردەمی دروستکردنی گڵێنە -فخار- کە پێش سەردەمی نووسین کەوتبوو، کۆدەبوونەوە و نیشتەجێ دەبوون، لەوەش دەچێ کە دانیشتووانی شوێنەکانی دیکە وەك -تل حسونە- و -تل الصوان- کەڵکیان لە ژیاری ئەمانە وەرگرتبێ.

دوای ئەوەی پاشا هەوەڵینەکانی سۆمەر و ئەکەد هێرشیان کردەسەر وڵاتی سوبارتۆ ((شێوازی سۆمەری -ئەکەدی، بۆ چەمکی وڵاتی بەرزایی)) لە هەزارەی

سێیەمی پێش زایین، کۆنترین تۆماری خەتە بزمارییەکان ئاماژە بەوە دەکا کە پارچەی کیرخی –قطعە کیرخی- (کرخا/قەلا) دەکەوتە ئەرابخاوە لە هەرێمی کوتیوم.

لەسەر ئەم بنەمایە دەبێ کوتییەکان قەلای کەرکووکییان بنیات نابێ، بەلام، حورییەکان لەگەڵیاندا ژیان، لەسەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زایین، لەوێ و لەو نیشتەجێیانەی –المستوطنات- دەوروبەریشی وەك تۆزی و کوروخانی، ئەمەش لە ئەنجامی هاتنی هیندیە –ئارییەکان بوو بۆ بەرزاییەکانی زاگرۆس و ناوچەکانی باکووری دۆڵی دوو رووبارەکە، کە بزاڤی عیبرییەکان وەی دیکەشی لێ کەوتەوە، لە سوبارتووە بەرەو ناوچەکانی خوارووی دۆڵی دوو رووبارەکە و سوریا. ئەم بزاڤەش لە لایەن میسرییەکانەوە لە مێژوودا ناوی کۆچی هکسوس (هیکاخسوت – رەوەندەکانی ئاسیا-)ی لێنرا.

قەلای کەرکووك لەسەر گردێکی خڕی چوار گۆشەیی بنیات نرا کە (١٢٠) پێ لە دەشتەکانی دەوروبەری بەرزتر بوو و دەیڕوانییە رووبارێکی بچووکی کەم ئاو لە وەرزە باراناوییەکاندا لافاوی هەڵدەسا و ناوی –خاصە چای- بوو. لەوەش دەچێ ئەم قەلایە لە چەرخە کۆنەکاندا شورای هەبووبێ، هەروەها چوار دەرگاشی هەبوو. کە عوسمانییەکان ئەم ناوانەیان لێ نابوون: دەرگای سەرەکیی قالدرمەدار، دەرگای (الطوب) و دەرگای حەوت کچەکان –البنات السبع- و دەرگای حەلواچیەکان –الحلوچیە-.

بە گوێرەی ئەو نەریتەی کە لەسەردەمی عوسمانییەکاندا باو بوو، بازارەکان، هەر یەکێکیان تایبەت بوو بەشتێك و جۆرێك و چوار دەوری قەلایان دابوو، بەلام فەرمانگە و سەرای حکوومەت، دەکەوتنە ناو قشلە کە لە بەری رۆژئاوای رووبارەکە بنیات نرابوو، بە گوێرەی یادگارییەکانمان ئەم قەلایە هەندێ جێ نزرگە –مزارات- و مزگەوت و تەکیە و پاشماوەی چەند بینایەك و شوێنەوارێك گەڕانەوە بۆ سەرەتای چەرخی مێژوویی (هەزارەی سێیەم و دووەمی پێش زایینی)ی تێدابوو.

هەروەها ئەو پارانەی لەناو دار و پەردووی ئەو ماڵانەدا دەماندۆزییەوە، بە زۆری هێمای ئەخمینی و هیللینی –سلوقی- و فەرسی (–فرثی-) و ساسانی پێوە بوو.

لەسەر گردەکەش قەڵایەکی –حصن- هەشت لایەنی –هەشت گۆشە- هەبوو، کە سەردەمەکەی دەگەڕایەوە بۆ چەرخی سلوقی.

بەناوبانگترین کۆمەڵگەی نیشتەجێ بوونیش لە قەڵاکەماندا دەکەوتە بەشی رۆژئاوا کە بە گەڕەکی ((حمام –حەمام-)) ناسرابوو و بۆ چەند سەدە موسڵمانەکان لەگەڵ برا مەسیحییەکانیاندا پێکەوە لەوێ دەژیان، هەروەها مەڵبەندی مەترانیەتی –مطرانیة- باجرامی Beth Garme و مزگەوتی دانیال پێغەمبەر دەکەوتنە هەمان گەڕەك.

لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە ئابوورییەی لە شارەکەدا پەیڕەو دەکرا، دوای ئەوەی خرایە پاڵ شانشینی عیراق و پیشەسازی نەوتی لە ناوچەکانی نزیك شار گەشەی کرد، وەك ناوچەی عەرەفە و باوەگوڕگوڕ –دوو میل لە باکووری رۆژئاوای شار- کە دەوڵەمەندترین کێڵگەی نەوت بوون لە جیهاندا لە سەدەی بیستەم، ئیتر ژمارەیەکی زۆری دانیشتووانی قەڵا هاتنە دەرەوەی قەڵاکە و نزیك بوونەوە لە رەواڵەتەکانی شارستانییەتی ئاسایی –تقلید-ی شێوازی ئەوروپایی کە لە بەشی رۆژئاوای رووبارەکە، دوای ئەوەی کرێکارەکانی کۆمپانیای نەوتی تێیدا نیشتەجێ بوو خەریك بوو زاڵ دەبوو. ئەو کرێکارانە زۆربەیان لە مەسیحییە ناوخۆییەکان بوون، یان لەوانە بوون کە لە هەکاری و تلکێف و ئەلقوش و بەرتەلە و ناوچەکانی دەوروبەری موسڵەوە کۆچیان کرد بوو بۆ کەرکووك.

هەرچەندە دانیشتووانی کەرکووك لە سەرەتای دروست بوونی شارنشینی عیراق تووشی هەندێ گیروگرفت هاتن لەگەڵ سەربازەکانی هێزی (لیڤی)ی ئاسووری کە لە لایەن خەڵکی ناوچەکەوە بە ((جەنگی ئەرمەن)) ناوبرا، ئەمە جگە لە بوونی جیاوازیی رۆشنبیری لە نێوان ئەو ئاسوری و کلدان و ئەرمەنییانەی هاتبوونە کەرکووك بۆ ئیش کردن لە کۆمپانیای – I. P. C-، لە لاییەك و ئەو کورد و تورکمان

و عەرەبانەی لە شارەکەدا بوون لە لایێکی دیکەوە، بەڵام پەیوەندیی نێوان هەموو ئەمانە هەمیشە لەبارە سروشتییەکەدا مایەوە، ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ئەو گەشەکردنە ئابوورییەی شانشینی عیراق بەخۆیەوە دیبووی. بەڵام دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموز ڕەواڵەتەکانی ژیان بە گشتی ئاڵۆز بوون، کاتێ کە لە ئەنجامی لاواز بوونی دەسەڵاتەکانی بەڕێوەبردن کەلێنێکی گەورە کەوتە ڕێرەوی هزری —الاتجاه الفكري- خەڵك، کە ئەمەش لە بنەڕەتدا بە هۆی بەرژەوەندی و ئەنجامەکانی سیاسەتی بەریتانیاوە بوو، کاتێ کە کۆمەڵی گەل و نەتەوە و تایەفەی نارێك و ناتەبا، لەڕووی ئایینی و باوەڕ و زمانەوەی بە یەکەوە گرێدا، لە چوارچێوەی شانشینێك کە بنەماڵەیێکی ناعیراقی بەڕێوەی دەبرد.

حیزبە سیاسییە عەرەبییەکان هەوڵیاندا ئەم گرفتە چارەسەر بکەن لە ڕێ و بەپێی بۆچوونە ئایدۆلۆجیا جیاوازەکانیانەوە کە لە نێوان چەپ و ڕاست و میانڕەو و توندرەو دابەش ببوون، کوردیش ڕێگەی بەرگریی لە خۆی و بوونی نەتەوەیی خۆی گرتەبەر، لەڕێی داواکردنی کەمترین ماف هەروەها لەڕێی دۆستایەتی ئەو هێزانەوە کە دژایەتی کوردیان نەدەکرد.

بەمجۆرە ململانێ کەوتە نێوان هەموانەوە، جا یان بە ناوی بەرگری کردن لە دەستکەوتەکانی شۆڕشی (١٤)ی تەمموز یان بەرگری کردن لە عەرەبایەتی عیراق و پێکهێنانی یەکیەتی دەسبەجێ —فوری- لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەککگرتوودا.

ئەنجامەکانی ئەم کەلێنە لە کەرکووکدا بەشێوەیەکی تایبەتی ڕەنگیدایەوە، دوای ئەوەی —عبدالكريم قاسم- بایدایەوە بەرەو لای هێزە ڕاسترەو و توندرەوە عەرەبییەکان پاش ئەوەی ئەوان هەوڵیاندا بیکوژن.

ئەوە بوو ژمارەیێکی لەوان لە دام و دەزگاکانی جێبەجێ کردندا لەم شارەدا دامەزراند و کوردەکانیشی گواستنەوە دەرەوەی شارەکە، بەمەش دەیویست لە هێزی چەپی توندڕەو کەم بکاتەوە، چونکە ئەم هێزە توانیبووی ژمارەیەکی زۆر لە جەماوەری نەتەوە و تایەفە غەیرە عەرەبییەکان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە.

نەتەوەییە عەرەبەکان و بەعسیەکان، ئەم هەلەیان قوستەوە، بۆ ئەوەی جێ پێی خۆیان قایم بکەن لە دام و دەزگاکانی کەرکوکدا و دەسەڵاتی خۆیان دژی کۆمەڵگەی رەسەنی کەرکوك لە غەیرە عەرەبەکان توند بکەن دوا بەدوای ئەوە بارەکە ئاڵۆزتر بوو بەتایبەتی کاتێ کە پرۆسەی تەعریب و تەبعیس لە هەموو دام و دەزگاکانی دەوڵەتدا دەستی پێکرد. هەر لەسەر ئەم بنەمایە هەموو ئەو فەرمانبەرە کوردانەی لە دام و دەزگاکانی جێبەجێکردندا –الادارات التنفيذية- کاریان دەکرد، هەروەها هەموو کرێکار و شارەزایان لە کۆمپانیای نەوت دەرکران کە ئەمانیش هەر هەموویان کورد بوون. کاتێ کە بەعسیەکان بازنەی سیاسەتی رەگەزپەرستانی عەرەبیی خۆیان فراوانتر کرد دەستیان کرد بە دەرکردنی کورد لە ماڵ و حاڵی خۆیان و دەستیان گرت بەسەر هەموو گوند و شارۆچکە کوردییەکاندا و دوای ئەوەی لەرووی ئیدارییەوە لە کەرکووکیان کردەوە هەر هەموویان ((تمليك)) کرد. لە دوایشدا کەوتنە پەیرەوکردنی سیاسەتی جینۆساید دەرهەق بە کورد.

بەمجۆرە و لە ئەنجامی ئەم سیاسەتەوە کێشەیەکی ئاڵۆز هاتەکایەوە کە بریتی بوو لە هەرەشەکردن لە مافی مرۆیانەی گەلێك بە تەواوی، ئەو گەلەی بە کۆمەڵ بڕیاری بەجێهێشتنی وڵاتی خۆیدا لە ساڵی ١٩٩١ و تائێستاش لاوەکانی هەر رێی کۆچیان گرتووەتەبەر.

هەندێ لە ئەندامانی دەستەی ئامادەکار کە سەرپەرشتی دیداری زانستییان سەربارەت بە کەرکووك رێکخستبوو لە لەندەن لە نێوان رۆژانی ٢١ و ٢٢ی مانگی تەمموزی ٢٠٠١، نامەیەکیان بۆ ناردم و داوایان لێکردم کە بەشداری لەو دیدارە بکەم، بە بەرهەمێکی نوێ کە پێشتر بڵاونەکرابێتەوە. ئێمەش ئەم داواکارییەمان بە هەلێکی لەبار زانی تاکو ئەو راستیە مێژووییانەی پەیوەستن بە کەرکووکەوە بخەینە بەرچاوی غەیرە کورد.

لەبەر ئەوەی ئێمەش لەدایکبووی قەڵاکەی ئەم شارە دێرینەین و لە خۆش و ناخۆشی شارەکەدا بەشمان هەبووە و لە قوتابخانە سەرەتایی و دواناوەندییەکانیدا

خوێندوومانه و ماوەیەکیش تیایدا مامۆستا بووین، پاشان له ئەنجامی سیاسەتی سەرکوتکردن ناچاربووین له سەرەتای تەمموزی ١٩٦٨دا بەجێی بهێڵین و بەردەوام بین له خوێندنی باڵادا بۆ ئەوەی خزمەت بەو نیشتیمانه بکەین که تیایدا ژیان. بەڵام هێشتا سیاسەتی راستڕەوی توندڕەو، شارەکەمانی زیاتر بۆگەن دەکرد –تعفن-، هەر بۆیەش رێیان نەداین له شاری خۆماندا نیشتەجێ ببین، پاشان که ساڵی ١٩٨٢ خێزانمان پێکەوەنا، بە رەسمی مافی هاووڵاتی بوونیان لێ سەندینەوە و خۆمان و منداڵەکانمان مافی ئەوەمان لەدەستدا که له فەرمانگەی باری کەسی –دائرە الاحوال المدنیە- ئەو شارەدا ناونووس بکرێین، هەرچەندە مەڵبەندی له دایکبوونی خۆمان و منداڵەکانمان بوو. پاشان دەسەڵاتدارانی ئەو فەرمانگەیە هەموو ئەو راستییانەی پەیوەندییان بە کەرکووکی بوونی ئێمەوە هەبوو سڕییەوە، بەمجۆرە دەسەڵات هەموو مافە مرۆییەکانی زەوتکردین، وەك مافی کار کردن و خوێندن و نیشتەجێ بوون و زەوی و خانوو کڕین، له کاتێکدا ئێمە یەکێك بووین لەو بنەماڵانەی پێگەیەکی تایبەتیمان هەبوو له کەرکووك جگە له موڵك و ماڵ. پاشان دەسەڵاتی راستڕەوی توندڕەو ساڵی ١٩٦٢ دەستیان گرت بەسەر موڵك و ماڵی خوالێخۆشبوو باوکماندا، بە تۆمەتی یاخی بوون و ئەو پەیوەندییە شەخسییەی که باوکمان هەیبوو لەگەڵ خوالێخۆشبوو مستەفا بارزانیدا. دوای ئەوەش گرتیان و خستیانە بەندیخانەی پۆلیس و بەندیخانەی سەرای گەورەی کەرکووك و پاشان گواستیانەوە بۆ بەندیخانەی ((المسیب)) ساڵی ١٩٦٣، لەوێشەوە بۆ بەندیخانەی پۆلیسی ((الخناق)) له سەماوە له نێوان ساڵانی ١٩٧٥-١٩٧٧.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش دەسەڵاتدارانی ئەم شارە رێیان نەداین تەنانەت خانوێك بەکرێ بگرین و تیایدا بژین، پاشانیش ماڵی برا گەورەکەمیان تەقاندەوە بە مەهانەی ئەوەی برای هەیە له دەرەوەی عیراق و له خزمەتی سەربازی رایانکردووە و بەشداریی جەنگی کەنداویان نەکردووە.

ئیتر ناچار بووین لە وڵاتی خۆماندا و سەرەڕای ئەوەی لە زانکۆی سلێمانیش دەرسم دەگوتەوە کە پاشان گوازرایەوە هەولێر بە ناوی —زانکۆی سەلاحەددین-، ناچار بووم لە ئوتێلدا بژیم. لە هەولێریش بە تۆمەتی پشتگیری کردنی قوتابیانی زانکۆ لە کاتی مانگرتنی ساڵی ١٩٨٢، وەزارەتی خوێندی باڵا، بەناوی سەرەك کۆمار، لە سلێمانییەوە ئێمەیان گواستەوە بۆ بەسرە و خێزانەکەشیمان لە کاری ئەکادیمی خۆی بێ بەشکرد و لە بەغدا شوێنی نیشتەنیەکەیان دیاری کرد کە نابێ بەجێی بهێڵین —إقامە جبریە-.

لەگەڵ هەموو زەبر و زەنگی بەعسییەکان کە خەڵکیان پێ دەتوقاند، ئێمە بەهێمنی بڕیاری گواستنەوەمان بۆ بەسرە جێبەجێ نەکرد و لە ساڵی ١٩٨٢ و بە پشت بەستن بە یاسای کۆکردنەوە و پێکەوە ژیانی خێزانی —جمل شمل الاسرە- توانیمان لە زانکۆی بەغدا مافی ئیش کردن بەدەست بهێنین و لەگەڵ خێزانەکەماندا لە ئوتێلێك بژین، ئەو یاسایەش مافی ئەوەی پێ ڕەوا نەبینینی کەماڵێکمان هەبێ یان زەوییەك بە ناومانەوە بنووسرێ، ئەمەش بە مەهانەی ئەوەی کە بەشداریمان نەکردووە لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧دا و لە سنوری پارێزگای بەغدا.

بەمجۆرە لە شاری خۆمان کە تیایدا لە دایکبووین و لە شوێنی کارکردنماندا و لەناو سنووری وڵاتەکەماندا بووین بە نامۆ و لەو بێگانانەش بێ ماف تر بووین کە مافی باشی کارکردنیان هەبوو لە هەموو شوێنێکی وڵاتەکەماندا، وەك تایلاندی و چینی و میسرییەکانیش کە مافی ڕەگەزنامەی عیراقییان درایێ جگە لە مافی ژن هێنان و موڵك کڕین و نیشتەجێ بوون لە هەر شوێنێ کە بیانەوێ.

دوای ڕێککەوتننامەی کامپ دێڤد، دەسەڵاتی بەعس ڕێی پێدان کە پارە ڕەوانە بکەن بە دراوی بێگانە —العملە الصعبە- بۆ میسر، بە هەموو ئازادی و دڵنیاییەك، ئەو ئازادی و دڵنیاییەی ئێمەی لێ بێبەش بووین.

هەر چۆنێك بێت بەشدرای کردنمان لە ڕوونکردنەوەی رابردووی شاری کەرکوك و دەست نیشان کردنی داهاتووی شارەکە و گێڕانەوەی ماف بۆ شوێن و بۆ خاوەنەکەی،

جگە لە لایەنە ئەدەبی و رەوشتیەکەی، ئەرك و مافێکی بنەڕەتی مرۆیانە و نیشتیمانیانەی ئێمەیە. ئەو باسانەش کە لەم توێژینەوەدا دەخرێتەڕوو پەیوەندییان بە پسپۆری ئێمەوە هەیە لە مێژووی کۆنی رۆژهەلأت و بە کورتیش پەیوەندداره بە مێژووی کەرکووکەوە لە چەرخە کۆنەکاندا، بریتیشە لە کۆمەڵێ راستیی پەیوەندار بە مێژووی ئەم شارە و دانیشتووانە دێرینەکانیەوە.

لەم بوارەدا پشتمان بە سەرچاوەی جیاواز بەستووە، تیایاندا هەیە کۆنە وەك سۆمەری و ئەکەدی و ئاشوری و ئێرانی، تیاشیاندا هەیە تازەیەك وەك ئەڵمانی و ئینگلیزی و روسی، جگە لەو زانیارییانەی کە لە ماوەی ژیانماندا لەو شارەدا لە ناوەڕاستی سەدەی رابوردوو وەدەستمان هێناوە. هەوڵیشمان داوە لە گێڕانەوەی رووداوە مێژووییەکاندا واقیعیانە بیاننووسین و ئومێدەواریشین ئەم باسکردنە واقیعیەی ئەم بابەتە ببێتە هۆی وەدەستهێنانی چارەسەری تیۆری —حلول نظرية- راست بۆ ئەنجامەکانی دەستدرێژی کردنەسەر مافەکانی دانیشتووانی رەسەنی کەرکووك لە کوردەکان. سەرکەوتنیش بە دەس خوایە

دوکتۆر جەمال رەشید ئەحمەد

هۆڵەندا

٢٥/کانوونی یەکەمی ٢٠٠١ز

پەیکەری (إدریمی) پاشای –الالاخ- (تل عطشانە) –عامل-ی
ئیمپراتۆر ساوستاری میتانتی سەدەی پازدەی پێش زایین

پەیکەری —مسلة-ی نارام سن ٢٢٥٠-٢٢٠٠ پ. ز

مۆزەخانەی لۆڤەر

ژمارەیەك لەو سۆباریانەی سەرجۆن بردنی بۆ شاری ((أكد)) لە
هەزارەی سێیەمی پێش زایینیدا –مۆزەخانەی لۆڤەر–

تابلۆیەك كە خواوەند شاووشكای —حوری- پشان دەدا

لە دۆزراوەكانی —نوزی- هەزارەی دووەمی پ. ز

ئەو زەوییانەی کە ئیمپڕاتۆریەتی میتانیی لێ پێکدەهات لەگەڵ دیاری کردنی شوێنی هەریەك لە —أرابخا- و —نوزی- و —الالاخ- تیایدا.

تابلۆیەك لە چلەکانی سەدەی سێیەمی زایینی کە ئاماژە بە ڕێوڕەسمی بە پاشادانانی –تتویج– پاشای ساسانی ئەردەشێری کوڕی بابکان دەکا. نەقشی –رجب– ئێران

ئینسکلۆبیدیای بەریتانی ئاماژە بەوە دەکات کە شاری کەرکووك دەکەوێتە لێواری لاپاڵەکانی چیاکانی زاگرۆس لە هەرێمی کوردستانی عێراق(١) هەروەها دەکەوێتە ناوەندی کۆمەڵێکی ناسراوی شوێنە نیشتەجێیەکان و گوندە کشتوکاڵەکانی سەردەمی نیولیسی –النیولیثی- کە دەکەوێتە پێش سەردەمی نووسین وەك چەرمو لە باکووری رۆژهەڵاتی و مەتتارە –المطارە- لە باشووردا.

دیارترین رەواڵەتەکانیشی قەڵا بەرزە مەزنەکەیەتی کە لە رۆژهەڵاتی شوێنەواری کۆن و مەڵبەندی پیشەسازی نوێی ناسراو بە عەرەفە Arapha (شێوازی بەعەرەبی کردنی ارابخای Arrapha مێژوویی) دروستکراوە.

ئەم قەڵایەش هەتا ئێستا گوزارە لە پێشکەوتن و بەرهەمی ژیاریی دانیشتووانە سەرەتاییەکانی ناوچەی کەرکووك دەکا لە سوبارییەکان کە ناسنامە گشتییەکەیان (سوبیر یان سابار Subar ( Su. BIR) لای عیراقییە کۆنەکان پەیوەست بووە بە چەمکێکی جوگرافی کە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی ئێستای دەگرتەوە، کە خۆیان و خواوەندەکەشیان لای ئەکەدییەکان ناوبانگیان دەرکردبوو و بە (علیاتم) –Eliatim- ناسرابوو حامواربیش ((١٧٩٢-١٧٥٠ پ. ز)) بەشێوەی (ماتوم علیتوم –Matum Elitum- ولاتی بەرز) تۆماری کردبوو.

---

(١) ئینسکلۆبیدیای بەریتانی، ماددەی کەرکووك Encyclopaedia Britannica, Kirkuk دەقەکەی بەمجۆرە نووسیوە.

Kirkuk is located near the foot of the Zagros mountains in the Kurdistan region of Iraq.

بێ لێ ورد بوونەوە نووسەری وتارەکە دەڵێ شارەکە لە سەردەمی رینیسانسی ئاشوریدا پێی دەگوترا (اررابخا) (- دەقە ئینگریەکەی ئەو دێرانەی هێناوە، بەلام ئێمە بە پێویستمان نەزانی بینوسینەوە-) وەرگێری کوردی.

هەروەها هەمان شت لای C. J. Gadd دەبینین. بروانە بیروڕای ئەو لە سەرچاوەی خوارەوە:

C. J. Gadd, Kirkuk: Tablets from Kirkuk, Revued, Assyriogie etd' Archeologic Orrient, XXIII, Paris, 1929, P. 66 ff.

لەسەردەمی بابلی کۆندا ئەم هەرێمانەی دەگرتەوە (ماراهاشی، أورکیش، ناوار، کوتیوم، زاموا، سیموردم و أوربیلوم) فارسەکانیش کوهستانیان پێ دەگوت، عەرەبیش بە ولاّتی شاخ ناویان دەبرد. ئەم چەمکە لە هەموو حاڵەتێکدا رەنگدانەوەی باری تۆپۆگرافی ئەو هەرێمانە بوو نەك واقیعی رەگەزی و نەتەوەیی، دوای ئەمەش کە هیند و ئاریە سەرەتاییەکانی تێیدا نیشتەجێ بوو ئەوجا لەسەر هەمان بنەما بەشێوازی شیمالیا Simalia ناوی دەرکرد، ئەم ناوەش ناوی خواوەندەکەیان بوو سیمالیا (خواوەندی شاخە بە بەفر داپۆشراوەکان). ئیتر لای عەرەب بوو بە چەمکێك کە ئاماژە بە باکوور —شمال- دەکا، لای کوردیش بە شێوازی —شەماڵ- کە مانای بای ساردی ناوچە بەفرینەکان کە لە چیاوە هەڵدەکا ناسرا، لە هیندیشدا بەناوی هیالیا یان هیمالایا ناوبانگی دەرکرد[٢] ناوی سوبار لە دەقەکانی ئۆغاریتدا (ملەی شەمرا —رأس شمرا- لە باکووری لازقیە) بەشێوەی (شُبر Sbr) تۆمار کراوە، بەڵام إدریمی ی پاشای ئەلالاخ —الالاخ- ((سەدەی پازدەی پێش زایین)) بەشێوەی ((سوبیر Su. BIR)) تۆماریکرد بوو.

لەگەڵ ئەوەی ئەم ولاّتە زۆر فراوان بوو و زمان و شێوەزاری جیاجیای تێدا بوو، بەڵام لە لای سۆمەری و ئەکەدی و پاشانیش بابلی و ئاشورییەکانەوە نەزانراو بوو،

---

(2) B, Land sberger Zeitschrift für A ssyriologie und Verwamdte Gebiete, XXXV, Berlin – Leipzig S. 230.

لەوە دەچێ برگەی bar لەناوی su. Bar دا مانای دەرەوە (الخارج)ی دەگرتەوە کە ئێستا لای عێراقییەکان بوە بە (برە) و بە تێپەڕبوونی بوونی کاتیش ناوی سوبیر یان سوبار وای لێهات لای عێراقییەکان چەمکی ناوچەکانی باکوور بگرێتەوە کە زمانێکیان هەبوو ئەمان لێی تێنەدەگەیشتن.

لەسەر ئەم بنەمایە (حمورابی) لە یەکێ لە تۆمارگەکانیدا ئاماژەی بەوە کردوە کە (کوتیوم کی سوبارتو کی توکریش شا سادو — سون نیسو لیشان سونوإبرگو) واتە (کوتیوم و سوبار و توکریش کە چیاکانیان دوورە و زمانی خەڵکەشیان نەزانراوە و لێی تێ ناگەین).

بروانە:

E. A. Speiser, Mesopotamian origins, Philadelphia, 1982, P. 89.

خەڵکەکەشی لە دەقەکانی شاری (فارا)ی سۆمەریدا بە ((أوناس سوبر Lu- Lu- Subur) ناوبانگیان دەرکردبوو، هەروەها تۆمارەکانی شاری ئور لە سەردەمی بنەماڵەی سێیەمدا پیاوە سوبارییەکەیان —الرجل السوباري-بە (Lu- Su- Aki) وەسف کردبوو.

لەسەر بنەمای ئەم چەمکە سۆمەرییەکان لە سەرەتای سەردەمی مێژوودا زاراوەی –Su. BIR- یان بەکارهێنا، دوای ئەمەش ئەکەدییەکان پاشان ئاشوورییەکان زاراوەی ((سوبار، سوبور، سوبارتۆ، سوبارتیۆم، سوبارتۆم، شوبارو، شوبریا یان تەنانەت شۆراو)) یان بەکاردەهێنا بۆ ناوچە باکوورییە بڵندەکانی دۆڵی دوو رووبارەکە.[٣]

کۆنترین قەواڵەی مێژووی سۆمەری کە ئاماژەی بە ((سوبیر)) داوە، تۆمارەکانی لوکال ((أنی — موندو))ی فەرمانڕەوای شاری أدابا ((تل بسمایا —گردی بسمایا))[٤] بوو، لە نیوەی یەکەمی هەزارەی سێیەمی پێش زایین. بەمەبەستی زانینی هەواڵەکانی دەوڵەتی دراوسێکانی شانشینی —لجش- ئەم پاشا سۆمەرییە ناوەکانیانی تۆمار کردبوو، لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو باکوور، لەوێشەوە بۆ رۆژئاوا و بەجۆرە: ((ایلام،

---

(٣) ناوی سوبیر یان سوبار Su. BIR, Su. BAR لە نووسینەکانی پاشای شاری (لجش)ی سۆمەریشدا (إی أناتم) لە دەوروبەری ٢٤٧٠-٢٤٣٠ پ. ز هاتووە، واش پێ دەچێ ئەم ناوە لە دوو زاراوە پێکهاتبێ سو Su و بر BAR، بەڵام ئەکەدییەکان پاشگرێکیان بۆ زیادکرد کە تایبەت بوو بەناوە مێینەکان (tu-) بەجۆرە ناوەکە وای لێهات Subartu وەك وشە عەرەبییەکانی دیکە لە جۆری (الدولە —دەوڵەت-، المدینە —شار-، أو القریە —یان گوند). ئەم پاشگرەش کورتکراوەی پاشگرێکی پێشتربوو کە لە سۆمەریدا بە شێوازی (tum-) دەنووسرا، بەڵام ئاشوورییەکان ئەم ناوەیان بەشێوازی شۆراو یان شوبریا Supria تۆمارکرد. بڕوانە:

Fischer Weltgeschichte, Band 2, Die Altorientalischen Reiche, S. 103.

(٤) J. Laessoe, People of ancient Assyria, London, 1963, P. 25.

A. poebel Historical and Grammatical Texts, P. Bs (1914), 75, Col. 4.10, and 27-28, E Herzfeld, the Persian Empire Wiesbanden 1968, P. 55 f.

ماراهشی، کوتیوم، سوبیر، امورد، سوتیوم)) وەك دەبینین ناوچەی کوتیوم کە ئارابخا یەکێك بوو لە هەرێمەکانی و قەڵای کەرکووکیش کە مەڵبەندێك بوو لە مەڵبەندەکانی لە ((سوبیر))[5]ی جیاکردەوە و شوێنی (سوبیر)یشی لە نێوان هەرێمی کوتیوم و وڵاتی مارتویان امورو (واتە وڵاتی عاموریيەکان لە رۆژئاوادا) دانابوو جێگیری کردبوو.

لە کاتێکدا حاکمی -فەرمانڕەوا-ی ئەکەد کە نازناوی شاروکین یان سەرجون ((پاشای شەرعی یان راستگۆ ٢٣٤٠-٩١٨ پ. ز))[6] لە خۆی

---

(٥) زانیاری زیاتر لەبارەی شوێنی وڵاتی سوبیر لەم سەرچاوەیەدا ببینە:

E. A. Speiser, Mesopotamian origins, Phildelphia, 1930.

لە کاتێکدا نارام سن هەرێمی کوتیومی وەك بەشێ لە وڵای سوبارتو نووسیبوو. بڕوانە:

Royal Inscription from ur 274, 13, ed. c. J Gadd and L. Legrain (Publications of the Joint Expedition of the British Museum and the museun of the University of Pennsylvania to Mesopotamia pheladelphia 1928.

(٦) لیستی پاشا سۆمەرییەکان ئاماژە دەکا کە سەرجۆن (کە بریتییە لە گۆڕینی -تحریف- ناوی sharu-ken و مانای پاشای راستگۆ یان پاشای شەرعی دەگەیێنێ و هەر بەو ناوشەوە لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت).

لیستەکە ئاماژە دەکا کە سەرجۆن شاری ئەکەدی بنیات نا کە دوای بەزاندنی شاری وەرکا (بنەماڵەی وەرکای سێیەم) پاشایەتیی گواستنەوە بۆ ئەوێ، ئەکەدیش نزیك کیشە، رەنگە ئەم شوێنەشی لەبەر ئەوە هەڵبژاردبێ چونکە مەڵبەندێکی سەرەکی پەرستنی عەشتار بوو کەسەرجۆن هەر لە منالییەوە بە پارێزەری خۆی دادەنا، پەرستگای عەشتاریش لە شوێنێکدا بوو پێی دەگوترا (ولماش) ئەو لیستە هەندێ زانیاری باس دەکا سەبارەت بە دەسکورتی و نەبوونی سەرجۆن پێش ئەوەی ببێ بە پاشا و دەڵێ بە منالی باخەوان بووە پاشان بووە بە ناوگێڕ (ساقی) لای پاشا — أورزابابا- (دووەم پاشای بنەماڵەی کیشی چوارەم) پاشان توانیویەتی لە پاشایەتی لای ببا و خۆی لە دوای ئەو ببێ بە پاشا. ئەفسانەیەکی پاشتر شتی دیکە سەبارەت بە دەسکورتی و نەبوونی سەرجۆن باس دەکا و دەڵێ دایکی گەورەی (کاهن)ەکان بووە لە (أزوبیرانو) لەسەر رووباری فورات، پاشان زگی بە سەرجۆن پڕبووە لە باوکێکی نەزانراو و بەنهێنی منالەکەی بووە، کە بوویەتی خستویەتە سەبەتەیەکی لە قامیش (قصب) دروست کراو و پاشان بە رۆنی -القار- چەوری کردووە و سەبەتەکەی فڕێ داوەتە رووباری فورات. ئەو سەبەتەیە جووتیارێك دەیدۆزێتەوە ناوی (إکی) بووە

نابوو، ئاماژه بەوە دەکا کە (إشتامات خور – ساگ إیری/ننی إدی أساس //
زا-اس// کی مات سوبیر) شوێنەکەشی روون کردبووەوە کە (ماتام عالليتام
ما –ری- ام لارموتییام کی أیلاکی أدیماگیش. تیرگیش إیرین أو کور کور
کو)یە. واتا سوبیر بریتییە لە ولآتە بلندەکان تاکو إبیلا ((گردی –عطشانة-
لە باکووری رۆژئاوای حەلەب)) هەروەها هەموو ولآتی کور کور –چیاکان- کە
حیسیەکانیش –الحیشیین- ناوەکەیان بە شێوازی ((کور أوگو)) دارشتبوو.
ئەمەش بە بڕوای ئارنیست هۆتسفیلد Ernest Herzfeld. ناوچەکانی
باکووری فورات و دۆڵی رووبارەکانی مورادسو و دیاربەکر و ناوچەکانی پالا و
تومانا لە ناوەندی کوردستانی دەگرتەوە[٧] پاشان ئارام سین کوڕە زای –
حفید- سەرجۆن ((٢٢٦٠-٢٢٢٣ پ. ز)) ناوی خۆی دەنێ پاشای علیاتم، ئەو
زاراوەیەی پاشان گۆڕا بۆ عیلاتی[٨]. هەروەها ئەم ولآتەش بە هۆی زاراوەی
(ماتوم عیلیتوم) لە تۆمارەکانی زیمریلیم ((١٧٥٩-؟؟)) پاشای ماری کە
هاوچەرخی حامورابی بوو (١٧٩٢-١٧٥٠ پ. ز) دەناسین و دەبینین.
نووسراوەکانی ئەم پاشایە کە لە شاری ئور دۆزرایەوە گەلێك بەڵگەی گرنگی
تێیدایە سەبارەت بە سوبارییەکان لە ولآتی بەرزایی[٩]. J. F. Finkelstien
ئەم راستییە دەسەلمێنێ و دەڵێ:[١٠]

---

و سەرجۆنی کردووە بە کوڕی خۆی و گەورەی کردووە و پاشان کردوویەتی بە باخەوان. کە گەورە
بووە عەشتار حەزی لێی کردووە کردوویەتی بە پاشای ئەکەد.

(٧) بروانە:.E. Herzfeld, the Persian Empire Wiesbaden, 1968, P. 58

(٨) بڕوانە: .Landsberger, OLZ, 1930, Col, 130 f

(٩) بڕوانە E. A. Speiser, Mes. Or. P. 126 حامورابی ئەو ناوچانەی دەکەوتنە باکووری بابل و لە
رۆژهەلآتی رووباری دیجلەی بە بەشێك لە ولآتی بەرزایی –ضمن البلاد العلیا- دانا و دابەشی کرد بەسەر ئەم
هەرێمانەدا ((ماراهاشی، سوبیر، کوتیوم، أشنونا، مالکیکی، سوبیر، کوتیوم، سوبیرن توکریش)). روانە:
Sir Sidny Smith, Excavation Texts I, London, 1923, p. 73.

(١٠) بگەڕێرەوە، بۆ رای فنکشتاین لە کۆنگرەی بیست و سێیەمی رۆژهەلآتناسان (کەمبریج
ئینگلتەرە، رۆژی بیست و سێی مانگی ئابی ساڵی ١٩٥٤ ز).

A major factor contribuing to the dificulties attending the subject of Subartu, Subarians and Hurrians has been the paucity of onomastic evidence both for ethnic and the geographic aspect of the problem.

جا ئەگەر وڵاتی سوبار یان سوبیر لەم سەردەمەدا و بەپێی زانیارییە دەگمەنەکانی لای سۆمەرییەکان، ئەم زەوییانەی گرتبێتەوە، کە دەکەونە نێوان بەرزاییەکانی زاگرۆس (کرماشان) و دەریای ناوەند (قرقمیش و ألالاح)، کەواتە گومانی تێدا نییە کە دانیشتووانی هەرێمی کوتیوم و دانیشتووانی ئەرابخا و قەڵای کەرکوکیشیان لەگەڵدا، زۆربەی دانیشتوانی سوبارتۆیان پێك دەهێنا کە دراوسێ بوون لەگەڵ زاموا (وڵاتی لولوبوم) لە رۆژهەڵاتەوە و سیموروم (دۆڵی زێی بچووك) لە باکووری رۆژهەڵاتەوە، هەورەها (أوربیلوم و اورکیش) لە باکووری رۆژئـــاواوە و شانشنیی (خمازی) لە باشوور کە دەکەوتە دەوروبەری چیای حەمرین[11]. وڵاتەکەشیان جارێ بە (مات کوتیوم –وڵاتی کوتیوم-) ناوبراوە، جارێکیش بە (کورکوتیوم –چیاکانی کوتیوم-) لەسەر بنەمای ئەم زانیارییانە دەتوانین بەڵگەی مێژوویی ئاشکرا بدۆزینەوە بۆ دەسنیشان کردنی شوێنی هەرێمی ئەرابخا لەم سەردەمە سەرەتاییەی چەرخی نووسیندا و دیاریکردنی سنوورەکەی کە دەکەوێتە نێوان سیمورم (هەردوو رووباری زاب) و یاڵمان (هەردوو رووباری ئەڵوەند و دیالە). بە واتایێکی دیکە دەکەوتە

---

(١١) ناوی (سیحوروم) لە تۆمارگەکانی شاری نوزی داهاتووە وەك دراوسێی ئەو شارە بێ و بەسۆمەری پێی دەگوترا Sir. Ur. Ru لە ئەکەدیشدا za, ban.

سەبارەت بەم باسە بگەڕێرەوە بۆ هەر یەك لەمانە

E. Herzfeld, the Persian Empire, Wiesbaden. 1968. p. 75, Lous D. Levine "Geographical Studies in the neo Assyrian Zagros" IRAN, Vol XII, (1973), P. 112.

بەپێی بۆچوونی ئەفرام سپانزەر کوتیوم تا وڵاتی لولو بەشێك بووە لە وڵاتی سوبارییەکان بڕوانە

E. A. Speiser, Mesoptamian origins, the Basic population of the near east, Philadelphia, 1930, p, 126.

تۆمارگەکانی بنەماڵەی سێیەمی ئور بەمجۆرە باسی ئەو ناوچانە دەکا کە لە دەوری ئەرابخا دان ((گاغار، سیحوروم، لولوبوم، خزمورتوم، کیماش، کاگالات و أوربیللوم)).

هەرێمی —أوربیلوم- و بەرزاییەکانی حەمرین، قەڵای کەرکووکیش کە مەزندە دەکرێ پێش ئەم چەرخە دروست کرابێ و دەتوانین سەردەمی دروست کردنەکەی بگەڕێنینەوە بۆ نێوان هەزارەی پێنجەم و چوارەم ((٤٥٠٠-٣٥٠٠ پ. ز)). ئەم قەڵایە لە دیاردە و ((حصن))ە هەرە دیارەکانی شارەکە بوو.

کاتێ کە لە تۆمارەکانی سۆمەری و ئەکەدییەکاندا باسی ئەو تەوەرە —محور- بەرزانە دەکرێ کە دەگاتە ناوچەکانی هەردوو زێی گەورە و بچووك، ڕێگەی سوبارتۆ لە دوای هەرێمی لوبدی (بردان تپە و جلولاء)وە دەست پێدەکا و لە هەرێمی ئەرابخادا[١٢] بەردەوام دەبێ کە بە دەغڵ و کێڵگەی زۆر ناوبانگی دەرکردبوو و کەرکووکیش یەکێك لە مەڵبەندە بازرگانییە هەرە گرنگەکانی بوو.

لەو پارچە —لوح- دۆزراوانەی لە نوزی ((گاسوری کۆن —گاسور القدیمە)) دۆزرانەوە ئاماژەی روونی تێدایە کە کوتییەکان، کە کۆنترین دانیشتووانی کەرکووك و دەوروبەری بوون، خەریکی شوانکارەیی بوون لە دەشتاییەکانیدا کە تاکو لوبدی دەکشا، هەروەها بازرگانییان بە خوری و گۆشت و بەرهەمە ئاژەڵییەکانی دیکەیان دەکرد، کە هەندێکی بە زاراوەی SIG gu.ti,um, Siptum> Qutu,t(um) واتە تووکی بزنی کوتی.

دوای هێرشەکانی پاشاکانی سۆمەر، هەردوو پاشای شاری ئەکەد سەرجۆن و نارام سین، لە ریموش (٢٣١٥-٢٣٠٧ پ. ز) و براکەیماینشتوسو (٢٣٠٦-٢٢٩٢ پ. ز) زیاتر کۆیلەیان لە ناوچەی ئەرابخا و کەرکووك بەرەو باشووری عیراق راپێچ کرد، هەروەها سامانێکی زۆری ئاژەڵیشیان لە هەموو ناوچەکانی سوبارتو تالآن کرد و تالآنیەکی زۆری (کان)یشیان رەوانەی مەڵبەندی فەرمانڕەوایی خۆیان کرد.

---

12- E. Herzfeld, the Persian Empire, Wiesbaden. 1968. p.152.

سەرجۆن بەردەوام بوو لە هێرش بردن و چووە ناو ولآتی سیموورم لە دەشتی رانیەی ئێستادا بڕوانە:

H. Al-Fouadi, Inscription and Reliefs from Bitwata, summer, 34, pp. 122-129.

دەقێکی سەرجۆنی کە ناوی (لعنه أکد —نەفرەتی ئەکەد-))یان لێنا ئاماژە بەوە دەکا کە ((ئەکەد پڕ بوو لە زێڕ و ماڵەکانیش بە زیو رازێنرابووەوە، کۆگاکانیشی مس و قورقوشم و پارچەی لازوردی بۆ هێنرا و ئەملا و ئەولای شوێنی هەڵگرتنی دانەوێڵەکانیشیان —صوامع الغلال- لەبەر زۆری دانەوێڵە لەناویاندا هەڵاوسابوون.[١٣]

لە سەردەمی گودیای پاشای —لجش- (دەوروبەری ٢١٢٠ پ. ز) کوتیوم — کەرکووك و دەوروبەرەکەی- هەموو جۆرە کانێکی رەوانەی سۆمەر دەکرد.

شایانی ئاماژە پێکردنە کە هەرێمەکانی (کارخار، سیموروم، شاشروم و أوربیلوم) لەگەڵ أرابخا و نوزی (کەرکووك و لەیلان). لەسەردەمی هێرشەکانی پاشاکانی سۆمەر وەك شولغی (١٩٨١-١٩٧٣ پ. ز) و (أمارسین)ی کوڕی (١٩٨١-١٩٧٣ پ. ز) جگە لە کوتییەکان حورییەکانیشی تێدا دەژیا.[١٤] کاتێ کە ((شمشی عدد)) و ((إشمی

---

(١٣) د. احمد امین سلیم —دراسات فی تاریخ الشرق الاردنی القدیم. بیروت ١٩٨٩ ص ٢٩٦

14- W. Hall, the Road to Emar, 18 Journal of Cunieform studies new haven 1964, pp. 57-88.

شاری نوزی (-یورغان پتە-ی نزیك لەیلان لە خوارووی رۆژاوای کەرکووك) بۆ نموونە شوێنی نیشتەجێ بوونی گوتیەکان بوو بە ناوی Gasur حوریەکان لە کۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زایینیدا چوونە ناوی و پاشماوەی ژیاری —المخلفات الحضاریة- خۆیان تێدا جێهێشت و ئێستا بە یەکێك لە نیشتەنییە حورییە دەوڵەمەندەکان دادەنرێ لەرووی تۆمارگە بزماریەکانەوە.

زانایانی شوێنەواری ئەمریکی دەستیان کرد بە پشکنین لەم شوێنەدا لەماوەی نێوان ١٩٢٥-١٩٣١ و کۆمەڵێ پاشماوەی شوێنەواریان تێیدا دۆزییەوە کە دەگەڕانەوە بۆ ماوەی چەرخی پێش مێژوو و چەرخی رۆمانی —فەرسی ((فرثی)) و ساسانی.

لە نێوان سەدەی شازدە و پازدەدا لەم شوێنەدا کۆمەڵگەیەکی بازرگانی و ئیداریی گرنگی تێیدا دروست بوو. بەداخەوە ئەو هونەرە گڵێنییانەی —الفنون الفخاریه- لەم شوێنە دەرهێنران لێیان نەکۆڵرایەوە، لەگەڵ ئەمەشدا جۆرێکی تایبەتی قاپی گڵێنەیی —أوانی فخاریه- هەیە کە بە قاپی نوزی —یان قاپی میتاننی- ناسرابوون و خاوەن —مواصفات-ی تایبەت بوون هەندێکیان لە بەردی

داغان))ی ئاشووری ویستیان لەم ماوەیەدا شارە سەرەکییەکانی باکووری دۆڵی دوو ڕووبارەکە داگیر بکەن، پاشاکانی هەموو ناوچە سوبارییەکان ناوی ((حوری)) یان هەبوو وەك ((أتل شین)) پاشای بوروندوم و ((شوکروم تیشوب)) پاشای ((إلاهوت)) و ((نانیب شافیری)) پاشای ((خابوراتوم)) و ((شادو شارری)) پاشای ((أزوخینوم)) و ((تیش أولی)) پاشای ((ماردمان)) و ((شیننام)) پاشای ((أورسوم)) و ((أنیشوربی)) پاشای ((خاشوم)) لە باکووری حەڵەب.[١٥]

هەروەها فیرعەونەکانی میسریش نامەکانی پاشاکانی –میتاننی- یان لە دۆسیەکی تایبەتی ئەرشیفی خۆیاندا هەڵگرتبوو و مۆریکیان لێدابوو و بە ناونیشانی (نامەکانی وڵاتی سوباری یان زوباری)[١٦] تۆماریان کردبوو.

لە تۆمارەکانی حەمورابیدا بە درێژی باسی ململانێی بابل و ئاشورکراوە و چۆنیش بەردەوام خێر و بێری وڵاتی کوتیوم و سموروم بە تالان براوە.

بەهەرحاڵ نارام سین لە تۆماری هێرشەکانیدا ئەرابخای بە بەشێك لە وڵاتی سوبارتۆ دانابوو، ئەو وڵاتەی وەك نوسیبووی لە باکووری عیراقەوە تاکو چیای ئەمانۆس لە ڕۆژاوا دەکشا. بۆ خوێشی کاتێ کە بەرەو دیاربەکر و لەوێشەوە بەرەو باکووری سوریا ڕۆیشتبوو، بەو ناوچەیەدا تێپەڕیبوو. ئەمە جگە لەوەی نازناوی

---

درێژ و ڕێك دروست کرابوون کە بنەمایەکی یان بنکەیەکی –قاعدە- بچووکی هەبوو لەگەڵ کۆمەڵە پەرداخێ کە وێنە و هێمای بە هەردوو ڕەنگی ڕەش و سپی لەسەر دروست کرابوو.

جگە لەم کارە هونەرییانە لە شوێنی نوزی ٤٠٠ پارچە –لوح- دەرهێنرا کە بەخەتی بزماری نووسرابوون و زۆربەی ئەو ناوانەی تێیدابوون حوری بوون.

ئەو بابەتانەی کە ئەو دەقانە باسیان کردبوو، بریتی بوون لەوانەی پەیوەندییان بە مەسەلە کۆمەڵایەتی و ئیدارییەکانەوە هەبوو، لەگەڵ بوونی بڕگەی وا کە لە حیکایەتە ئاڵۆزەکانی باوکە هەوەڵینەکان –الآباء الاولین- دەچوو کە هاوچەرخی (اسفار التکوین)ی کتێبی پیرۆز بوون.

15- A. Kammenhuber, Die Arier im-vorderen orient und die historischen wohnsitze der Hurriter, or 46, (Roma, 1977) p.p. 129- 144.
16- J. A. Kundt zon, Amarna: Die El-Amarnna Tafeln p. 1579.

هەموو پاشای ناوچەییەکان –الحلیین- لە کەرکووك لەگەڵ ناوی شوێنە سوبارییەکان شێوازی ((حوری))ی پێوە دیار بوو وەك تاهێشاتیلی فەرمانڕەوای ئەو ناوچانەی کە دەکەوتنە سەر زێی بچووك لە رانیە و (أزیخیننوم) کە دەسەڵاتی دەگەیشتە ناوچەیەکی فراوان و زۆری سوباری[17] و (پوتتیم-أتل Puttim – Atal) پاشای سیموروم کە رووبەرووی نارام بووەوە لە باکووری ئەرابخا.[18]

پاشاکانی کەرکووك لە کوتییەکان بەشێوەیەکی تایبەتی و پاشاکانی سوبارتۆ لە حورییەکان بەشێوەیەکی گشتی و بۆ ئەوەی لە پرۆسەی راپێچ کردن و بە کۆیلەکردن رزگاریان ببێ و بۆ ئەوەی هێرشە یەك لە دوایەکانی ئەکەدییەکان بۆ سەر ئەرابخا و ناوچەکانی باکووری دوو رووبارەکە رابگرن، هەوڵیاندا هۆیەکانی ئەم هێرشانە لە بناغەوە کۆتایی پێ بێنن. ئەوە بوو پاشای کوتی ((إریدوبزیر Erridupizir)) کە هاوچەرخی نارام سین بوو، دەسەڵاتی خۆی لە پێشدا بەسەر شاری (نفر Nippur)دا سەپاند و نووسنێکی دوور و درێژی تێدا بە جێهێشت کە تیایدا بە زمانی ئەکەدی خۆی بە پاشای سۆمەر و ئەکەد و پاشای هەر چوار لایەکەی جیهان وەسف کردبوو

---

17- W. G Lambert (Note brêve), Revue d'assyriologie d'archeologie orientale (RA Paris) 77, p. 95.

P. Michalowski, the Earliest Hurrian Toponymy A new Sargonic Inscription, Zeitschrift fur Assyriologic und vordeasiatische Archaologie (Z A), Leipzig 1968, S. 4-11

سەبارەت بە هەواڵەکانی دۆڵەکانی زێی بچووك وردەکارییەکانی بارودۆخە سیاسییەکەی شانشینی کواری کە لە دەشتی رانیەدا دروست بوو، هەروەها شەڕەکانی (أشمی داغان)ی ئاشوری و حامورابی بابلی لەگەڵ هۆزەکانی –التورککین-ە کوتییەکان لەوێدا بڕوانە:

J Laessoe, people of Ancient Assyria, London 1963.

18- A. K. Grayson, E. Solbergre, L'insciption gênêrale conte naram-suen, RA, 70, (1976).

(Sar-Lagab – سرلجب) پاشان پاشای کوتی (Sar Kibraat arba cim)[19]
کەوتە ململانێیەکی توندەوە لەگەڵ پاشای ئەکەد شار کالی شاری (٢٢٢٣-٢١٩٨

---

(١٩) پاشاکانی سۆمەر لەو بڕوایەدا بوون کە وڵاتەکەیان دەکەوێتە ناوەڕاستی دونیا کە لە هەر چوار لایەوە و لە سنووری زانیاری جوگرافیایی ئەوان و بەپێی بۆچوونی ئەکەدییەکان وڵاتانی (سومەر و سوبارتوم و عیلام و أمورو)ی دەگرتەوە.

بگەڕێرەوە بۆ تۆمارگەکانی نارام سن A. Ungnad Subartu, Beitrage Zur Kulturgeschichte und volkerkunde vorderasien, Berlin Leipzic, 1963, S. 45. کە (نارام سین)یش بەخۆی گوت (پادشای هەموو عیلام تاکو باراهشی وڵاتی سوبارتو تادارستانەکانی ⊢الارز-)) بەمجۆرە خۆی وەسف کرد و گوتی (دانوم شارکیبرات أرباعیم أبلو أکایدم)) واتە ((بەهێز، پاشای هەر چوار لای دونیا، خوای ئەکەد)) بڕوانە:

C. J. Gadd L. Legrain Publications of the Joint expedition of the British Meseumand the Meseum of the University of Pensylvania to Mesopotamia Philadephia, 1928, P. 73, E. Herzfeld the Persian Empire, P. 65.

بۆ خۆ گەورە کردن زۆربەی پاشاکانی رۆژهەڵات ناوی زل و مەزنیان لە خۆیان دەنا. ((توکولتی نینورتا))ی یەکەمی ئاشووری بەخۆی دەگوت پاشای ئاشوور و پاشای هەر چوار لای جیهان، پاشای مەزنی رۆژهەڵات و رۆژئاوای زەوی، پاشای کاردونیاش، پاشای سۆمەر و ئەکەد، پاشای دەریای سەروو خواروو، پاشای سوباری و کوتی و پاشای هەموو وڵاتان.

هەروەها چەن پاشایێك لە پاشاکانی ئاشوور بەخۆیان دەگوت پاشاکانی رۆژهەڵاتی خۆر و رۆژئاوای، هەروەها پاشای ئەو وڵاتانەی دەکەونە نێوان دەریای سەروو تا دەریای خواروو.

بە تێپەڕبوونی کات چەمکی (پاشای هەر چوار لای جیهان) لە دۆڵی دوو رووبارەکەدا نەماو بەکارنەهات بەڵام نازناوی (پاشای وشکایی و دەریا) لای عەرەبەکان و لەگەڵ پەیدابوونی ئیسلامدا هاتەوە کایە، تەنانەت پاشاکانی بنەماڵەی ئەییوب نازناوی (پاشای میرەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا) یان لە خۆیان نا. کە چی (رکن الله شاه سلطان) لە هەرێمی کرمان بووە (خاوەنی هەردوو وشکایی و هەردوو دەریا). هەشبوو بە خۆی دەگوت خۆری دونیا.

پ. ز) ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە پاشای حورییەکان لەم ماوەیەدا حوکمی أوربیلوم و أرابخا و ناوچەکانی سەرووی رووباری دیالەی[20] دەکرد جگە لە أورکیش، پاشان زۆربەی دەوڵەتی شارە سۆمەری و ئەکەدیەکان لە لایەن (أبلو-لو-میش)ی کوتییەوە ساڵی ۲۱۹۸ پ. ز داگیرکران.

ئارابخیەکان ((خەڵکی کەرکوك)) لە ماوەی گەورەتر و مەزنتربوونی دەسەڵاتی کوتییەکان حوکمی سۆمەر و ئەکەدیان کرد بۆ زیاتر لە سەدەیێك واتە تاکو ساڵی (۲۱۱٦ پ. ز)، لەبەر ئەمە لە دەوروبەری رووباری خابوورەوە پاشای حوری (کیکلب أتل --۲۲۳۰-۲۱۱٦ پ. ز) کە لە پایتەختەکەیدا نزیك عامودە دادەنیشت، لە باکووری سوریا هەوڵیدا سنووری شانشینەکەی فراوانتر بکا وەك تۆمارەکانی (بوغاز کویی) ((خنوشا — پایتەختی کۆنی حیسیەکان-)). بۆمانی روون دەکەنەوە، ئەم هەولانەش لەسەر دەستی ((أتل — شین)) کە لە پارچەیەکی برونزیدا تۆماری کرد بوو و لە بناغەی پەرستگای نزکال لە وڵاتی سۆمەر دۆزرایەوە، لەو پارچەیەدا کە بە خەتی بزماری نوسرابوو بە زمانی ئەکەدیش دەڵێ (أتل — شینی کوڕی إین شترمات، پاشای وڵاتی أورکیش و ناوازە کە هەموو ئەو زەوییانەی دەگرێتەوە کە دەکەونە نێوان رووباری خابور و دیالە).[21]

لەسەر ئەم بنەمایە و لە نێوان ئەو دێرانەدا کە لە دەقەکانی شاری —نیپور- نووسرابوو، کاریگەری زمانی حوری بەسەر دانیشتووانی شارەکانی سۆمەر و بابل دەبینین، ئەم کاریگەرییەش بریتییە لە لایەنە رێزمانییەکان و وشەی حوری و ناوی کەسیی سوباری.[22]

---

20- A. Finet, Adalsenni, roide Burundum, Revued. Assyriologie, 60 (Paris, 1977) P.P. 129-144.

21- P. Rost, Die Keilschrfttexte tiglat Pilesers III, Leipzik 1893, S. 24f, Z. 139 f.

22- I. J. Gelb, Hurrians at Nippur in Sargonic period, Festschrift Johannes Fredrich, Heidelberg, 1959, pp. 183-194.

لە لایەکی دیکەوە و بەمەبەستی گەیشتن بە ئامانجە ستراتیجییەکانیان لە ناوەند و خوارەوەی عیراقدا، پاشا کۆنەکانی ئاشور لە کاتی هێرشەکانی سەدەی نۆزدەی پێش زایینیدا تەوەری –محور- (اوربیلوم – اراٻخا) یان بەکاردەهێنا. لەسەر ئەو دوو پەیکەرەی (نصب) لە مۆزەخانەی لۆڤەر لە پاریسدا پارێزراون و کاتی خۆی لە ماردین و سنجار دۆزرانەوە، بە روونی ئاماژە دراوە بە هێرشەکانی (شمشی عدد)ی یەکەم لە خوارووی ئاشور، کە تیایدا دەڵێ، بێ ئەوەی ناوی أوربیلوم بهێنێ، ئەو زەوییانە لە (حیزە) تا (کاغالتی Kagalti) هی ولاتی ئەکەدن و لە کاغالتیشەوە تا (حلبا) ولاتی کوتیومە کە ئەربخاشی دەگرتەوە. لە کاتێکدا تۆمارەکانی بنەماڵەی سێیەمی شانشینی ئوور بە زۆری باس لەوە دەکا کە هەریەك لە ((گانخار، سیموروم، لولوبووم، خومورتوم، کیماش، کاگالات و أوربیلوم)) ئەمانە هەر هەموو هەرێمی ئەرابخا پێك دەهێنن. ئەم پاشا ئاشورییە پەرستگایەکی بۆ خواوەندەکەی (عدد) لە مەڵبەندی ئەم هەرێمەدا کە کیرخی (کەرکوك)ی پێ دەگوترا دروست کرد. هەر لە کیرخیشەوە (عدد نیراری)ی دووەم دوای هەزار ساڵ (٩١١-٨٩١ پ. ز) هێرشی کردەسەر ولاتی نامری، هەردووکیشیان مەبەستیان کیرخی شیلواخوا (کەرکوك شاری –بنی شالوا-) بوو. لە دێری دەیەمی پەیکەرەکەدا ئاماژە دەدا بەوەی هەر کەسێ لە نەینەواوە بچێ بۆ (لوبدی) –بردان تپە و جەلەولا[٢٣] بە ولاتی ئارابخادا تێدەپەڕێ. بەلام کە هێرشی کردە سەر دۆڵی سەرووی زێی بچووك و دەشتی بێتواتە لەرێی چیای هەیبەت سوڵتان لە کۆیەوە رۆیی. ئەوە بوو لە لایەکەوە لە جەنگدا بوو لەگەڵ (التوروکیین) کە فیدراسیۆنێکی خێڵەکی ی کوتیان لە ناوچەی پشدەر دروست کردبوو، لە لایەکی دیکەوە کەوتە ململانێیەکی درێژەوە لەگەڵ شانشینی بابل و ماری، بەجۆرە کوتیەکان لە ناوچەیەکی لەوە فراوانتر دەژیان کە سۆمەری و ئەکەدییەکان بۆی چووبوون.

---

(٢٣) سەبارەت دیاری کردنی شوێنی لوبدی بڕوانە:
J. Seidmann in Mitteilungen der Altorientalischen Gesellschaf Lepzig, 1935, S. 3.

جا ئەگەر ولاّتی کوتییەکان لە سەرەتای سەردەمی نووسیندا بەپێی زانیارییەکانی پاشاکانی سۆمەر و ئەکەد لە سەرچاوە بەرزەکانی زێی بچووکەوە دەست پێدەکا پاشان بەرەو ئەرابخا و مەڵبەندەکەی (کیرخی) تا رووباری ئەڵوەن دەکشێ، ئەوا (أکوم کاکریمی Agum Kakrimi) -۱٦۰۲-۱٥٨٥ پ. ز-ی پادشای کاشییەکان لە بابل، خۆی جگە لەمانەی باسمان کرد، بە پادشای هەرێمەکانی خارخار (نهاوند) و إلليبی (فرحان محلات) و سیماش (گوڵپایکان) دەزانی و ناوی ولاّتی کوتیومی لێ نابوو، کە شاری کارکاسیی نزیك هەمەدان مەڵبەندەکەی بوو و پاشان بوو بە بنکەی سەرەکی ئیمپراتۆریەتی میدیا.

ئەم پاشایە لە پرۆتۆکۆلەکەیدا دەڵێ، کە ئەو (پاشای کاشی و ئەکەد، پاشای ولاّتی بابل، کە -أشنوناك-ی پاشای بادان و ئەڵوەنی خستە ژێر رکێفی خۆیەوە، پاشای ولاّتی کوتی).

ئەم دەسەلاّت فراوان بوونەی پاشاکانی کاشییەکان دەتوانین بە دیاردەیەکی مێژوویی قۆناغێك لێك بدەینەوە کە بریتی بوو لە بلاّوبوونەوەی رەگەزی هیند و -ئاری لە نێوان دانیشتووانی ئەم ناوچانەدا و کەوتنە ژێر رکێفی هاورەگەزەکانی خۆیان لە پاشاکانی بابل کە بەناوی، ولاّتی کاردونیاش (واتە ولاّتی ملکەچ بوون و بۆ خواوەندی زەوی) فەرمانڕەواییان تێیدا دەکرد، هەر لەرێی ئەمانیشەوە تەقسە ئایینییەکانی هیندو -ئارییەکان لە ناو دانیشتووانی هەموو ناوچەیەکی ولاّتی دوو رووبارەکەدا بلاّوبووەوە.

لە تۆمارەکانی بابل و نوزی و أورکیش دا و لە پاڵ خواوەندی پەرستراوی ناوچەی دوو رووبارەکە و زاگروسدا وەك (مردوخ و عشتار)ی بابلییەکان و (کوماربی) سەرۆکی کۆری خواوەندی حورییەکان، هەروەها (حیبات)ی خێزانی یان (حیوات)ی دایکە خواوەند کە جولەکەکان لەسەردەمی ئیبراهیم پێغەمبەرەوە بە دایەگەورەی هەموو بەشەریان دانابوو و هەر لەرێی ئەوانیشەوە هاتە ناو زمانی عەرەبییەوە بە شێوەی (حواء).

له پاڵ ئەم خواوەندانەدا ناوی خواوەندی (هیند و ناری)یش دێت وەك خوای هەتاو سوریاش (أسورای میتاننی و ناهورای ئێرانی > ناووری کوردی)، هەروەها خوای رەشەبا بوریاش (بوریای روسی Bypa و Boranی کوردی) و هورفتات و ماروتاش کە لە قورئانی پیرۆزدا باسکراون وەك (الملکین ببابل هاروت و ماروت)[٢٤] لە لایەکی

---

(٢٤) بڕوانە سورەتی ((البقرة)) ئایەتی (١٠٢) هەرچەندە قورئانی پیرۆز ناوی هاروت و ماروتی بێ روونکردنەوەی پێویست هێناوە بەڵام تەبەری ((الطبری)) کە ئەم چیرۆکە راڤە دەکات پشت بە هەندێ ئەفسانەی باوی سەردەمی خۆی دەبەستێ، مەلایکەت وەك تەبەری دەڵێ لە دەست خراپە و گومرایی بەشەر کەوتنە سکالا: خوا ویستی مەلایکەتەکان تاقی بکاتەوە -ابتلاء- هەڵسا دوو مەلایکەتی لە هەمووان پاکژتر کە هاروت و ماروت بوون رەوانەی زەوی کرد بۆ ئەوەی فەرمان بە چاکە بدەن و رێ لە خراپە بگرن، بەڵام ژنێکی زۆر جوان رێی پێگرتن، ئەوانیش داوای ئیشی خراپیان لێکرد، بەڵام ژنە رازی نەبوو و مەرجی ئەوەی بۆ دانان کە لە ئایینی خۆیان وەرگەڕێن و بت بپەرستن، بەڵام ئەوان قبووڵیان نەکرد، پاشان دیسان چوونەوە لای دیسان قبووڵی نەکرد، بەڵام مەرجی بۆ دانان کە دەبێ یەکێ لەو سێ خراپەیە بکەن: یان بت بپەرستن، یان یەکێ بکوژن یان مەی بخۆنەوە، ئەوانیش مەی خواردنەوەیان هەڵبژارد، ئیتر ئەویش مەی دەرخوارد دان و خواردیانەوە تاکو گێژبوون و هۆشیان لای خۆیان نەما، ئەوسا هەردووکیان (ئیشەکەیان) لەگەڵیدا کرد، لەم کاتەدا پیاوێك بەو ناوەدا تێپەڕی، ئەوانیش ترسان کارەکەیان ئاشکرا بکا بۆیە کوشتیان. دوای ئەوە ویستیان بگەڕێنەوە بۆ ئاسمان بەڵام نەیانتوانی. ژنەکە داوای لێکردن ئەو قسانەی فێر بکەن کە بەهۆیەوە سەردەکەونە ئاسمان، ئەوانیش فێریان کرد، رۆیشت بەڵام لەوێ بە هەڵواسراوی مایەوە لە شێوەی ئەستێرەی (الزهرە)... تاد. هەروەها بگەڕێرەوە بۆ (فراس السواح) نهێنی مەتەڵی عەشتار -لغز عشتار- خواوەندی ژن و ئەسڵی ئایین و ئەفسانە. دیمەشق ١٩٩٣ ل ٩٩، بەڵگەی زۆریش هەیە سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی رستە و وشەی کوردیی کۆن لە باکووری دۆڵی دووڕووبارەکە. ساڵی ١٣٨٠ پ. ز (کیکولی) لە تۆمارگەکانیدا کە لە (بوغاز کویی) دۆزرایەوە ئاماژە دەکا کە asua san (سانس)، ئەو نازناوەی کورد بە هەمان شێوە بەکاردەهێنن یان بە شێوەی aspawan، هەروەها بڕگەی sanیش دەچێتە زۆر ناوی کوردییەوە وەك جافرسان یان کانی سانان.

دیکەوە و دوای هەزار ساڵ پاشاکانی چەرخی سەرجۆنی لە نەینەوا بەردەوام هێرشیان دەکردە سەر ماڵەکانی کوتیەکان لە تەوەرەکانی —مخاور- ئامێدی و هەکاری و زاخۆ و تورعابدین و شەمدینان. کەواتە و بەپێ ی ئەم بۆچوونانە دەبێ دان بەوە دابنێن کە وڵاتی ئێستای کوردان لە رۆژئاوای ئێران و رۆژهەڵات و باکووری دۆڵی دوو رووبارەکە، بە تەواوی بە هەرێمی کویتوم لە وڵاتی سوبار ناسرابوو، ئەو هەرێمەی شاری کەرخی ((کەرکوك)) بە مەڵبەندی سەرەکیی دادەنرا، ئەو هەرێمە لەگەڵ (باراهاشی، سیموروم، خومورتوم) تاکو (أورکیش و ناوار) لە لای سۆمەریەکان و ئەکەدییەکان بە وڵاتی بەرزە —البلاد العلیا- ناسرا بوون، بۆیە ئەوەی ئەرنست هەرنسفیلد بۆی چوو بوو کە چەمکی میدیا، لە هەزارەی یەکەمی زانییندا هاوواتا بووە لەگەڵ کوتیومدا، بە تەواوی راستیی پێکاوە. سەرباری ئەمانەش ئەو ناوانە

Udgurlima, Gurpanza, Gurpaza, Kilamza, Kingistilinza, Hilipisua, Tunamisa, Burnamisa.

---

کە باسی نۆ خولەکانی —الدورات التسع- nara fraqwrsa پێشبڕکێی ئەسپیش دەکا -RACE COURSE، کیکولی چەند ژمارەیەك دەهێنن کە لە کوردیدا بەکاردێن وەك: eka, terra, panca, sausa, nawa (یەك، سێ، پێنج، حەوت، نۆ) کە لە کوردیدا بەمجۆرە دێتە

Ek, herra, panc, haut. Naw

هەروەها زاراوەی وای بەکارهێناوە وەك (uardan uartanne) کە لە کوردیدا بە مانای خول دێت و asua-reuse کە بریتییە لە asp rêz (رێکخستنی پێش برکێی ئەسپ) کە لە نۆ خول پێکدەهات و حەوت میلیش ماوەکە بوو. جگە لەمانەش پەیوەندی نێوان هەندێ وشە و رستەی کوردی دەبینین وەك (asp, bor, bardawaza, mizde, mard, ar-magan, aspabird (asua wird (ئەسپ، رەنگی بۆر، خاوەن بڕیار، مژدە، پیاو، دیاری، خاوەن ئەسپ) کە لەگەڵ هەمان شت لە میتانیدا پەیوەندییان هەیە.

Asua, babru, biryawaza, mista-nnu, mart, maga, uwardaasud.

که لەسەر پارچە –رقیمات- دۆزرانەوە لە هەمەدان دەری دەخەن کە دانیشتووانی ئەم ناوچانەش لە کوتییەکان بوون[25].

بەپێی ئەم شوێنە جوگرافییە، پاشا کۆنەکان وەك ((شمشي عدد))ی یەکەم و ((أريك دين إيلو)) و کەنجیسرەی میدی و دارای ئەخمینی، کە هێرشیان دەبرد، بە ناوچە و رێ و بان و شوێنی نیشتەجێ بوونی کوتییەکاندا تێدەپەڕین، کە دەوڵەمەند بوون بە پێویستییەکانی سوپا، هەروەها جگە لە جەنگاوەرە کوتییەکان عەرەبانە گوتیەکانیشیان بەکاردەهێنا کە بە ناوی (إيريقڤو ڤوتيتو Eriqqu qutitu) ناوبانگی دەرکردبوو، هەروەها کەڵکیان لە ئەزموونی کوتییەکانیش وەرگرت لە بەخێوکردنی ئەسپ و بەکارهێنانی لە جەنگدا، هەر بۆیە نابونائید لە ستوونی سێیەمی تۆمارەکانیدا ئاماژە بەوە دەکات کە (لە مانگی تەموزی ساڵی ٥٩٣ پ. ز).

---

(25) E. Herzfeld, the Persian Empire, Wiesbaden 1968, p. 191, 241.

نیشوب خواوەندی باو بۆرانی حوریـیەکان لەسـەر هەردوو لەپی پەرسـتراوەکانی شاخ وەستاوە تاکو بۆ خێزانەکەی (حوات) خواوەندی دایك هێمای (یازلی فیا) تەواو بکات و پێك بهێنێ (هونەری حەبەشی لە ئاسـیای بچووك)

کاتێ کۆرش هێرشی کرده سەر وڵاتی بابل، کوتییەکان پێش هەمووان لەبەر دەرگاکانی ((ئیساکیل –Essakkil-))دا جێگیربوون و سنووری –کوتیوم-یش بەپێی بۆچوونی پاشاکانی هەزارەی دووەمی پێش زایین لە باشوورەوە لە (أبولاتی) کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی (هالابا) دەس پێدەکات و روو دەکاتەوە وڵاتی زومیرونی (نیققوم کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی سەرچاوەکانی زێی بچووك) کە لە پاشاندا تەوەرێکی –محور- دروست کرد، ساردیسی ی پایتەختی لیدیای بەستەوە بە ((شوشە))ی پایتەختی ئەخمینەکان، هەر ئەم رێگەیە بوو کە هێرۆدۆت بە رێگەی شاهانەی ناو بردبوو.

لە پرۆتۆکولەکەی –أریك دین أبلو-ی بابلیدا ناوی شوێنە جوگرافییەکان بەمجۆرە هاتبوو ((توررووککی، نیقیمخی و قیتی، Turrkki, Nigimhi, Qeti)) لە کاتێکدا هەمان شوێن لە ساڵی ٣٧ی حوکمی حامورابی بەمجۆرە هاتبوو (توررووککی، کاکموم کورسو بارتوم) کە یەکێ لە سەرکردەکانی کاکموم لە سەردەمی سەرجۆنی ئاشوریدا (٧٢٢-٧٠٥ پ.ز) نازناوی کوردی (أسپابارا Asspabara)ی ((لاوچاك))ی هەڵگرتبوو.

لەکارە هونەریەکانی میتانی (تل بیلا) سەدەی پازدەی پێش زایینی

لەسەر ئەم بنەمایە دەکرێ ئاماژە بەوە بکرێ کە پاشای ئاشوری (شمشی عدد)ی یەکەم ((١٨١٢-١٧٨٠ پ. ز)) و دوای ئەوەی بە هەرێمی ((أوربیلوم))دا تێپەڕیوە چووەتە ناوخاکی نارابخا و لە مەڵبەندەکەیدا هەندێ قوربانیی ((ضحیة)) پێشکەش بە خواوەندەکەی کردووە، کە ئەم خۆی ناوی ئەوی هەڵگرتووە —خواوەند ((عدد))- سەرەنجی ئەوەشی دا کە ئەو ڕێگەیەی لە ((أوربیلوم))ەوە دەچێتە (ارابخا) لە نزیك کرخو (کرخینی=کەرکوك) دەبێت بە دوو بەشەوە، یەکێکیان لە خومورتوم (دوز خورماتو) دەچێتە أرمان (حلوان) و ئەوی دیکەیان دەرواتە ولاّتی (لولو) و زاموا (دربندی بازیان).

دوای دوو سەدە دەبینین پاشای وەك (اموریا إبن أوتا — مانسی وارن — أورخی وار — تیشوب و إلهیب — تیلا إبن وورو — کونی) و هی دیکەش لە ((کرخو))دا جێگیر بوون و بەپێی ئەو پارچە —رقیم-ە حوریيانەی بنەماڵەی وولو (Wullu) لە دیمتو —قەلاّ-[٢٦] تۆماریان کردبوو و لەسەرەتای سەدەی ڕابردوودا کەوتە دەست بێگانەکان، دەتوانین بڕیار بدەین کە ئەم نیشتەجێ بڵندەی ئێستا پێی دەگوترێ قەلاّی کەرکوك لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایین بە ناوی (دیمتو کرخی شیلواخا) —قەلاّی شاری بنی شیلوا-[٢٧] ناسرابوو، ئەو ناوەشی لە ناوی فەرمانڕەوا (حوری)یە کونەکەیەوە، پاشا

---

(٢٦) پارچەیەکی کورتکراوە لە نموونەی نووسینەکانی بنەماڵەی ولو کە بە زمانی حوری نووسراوە پێشکەش دەکەین: کە ئاماژە دەکا بە ئەو پارچەیەی —الرقیم- کە لە لایەن نیربیای کوڕی شیننا (کە) ولوی کوڕی بوخیشینای (تبنی) کرد و کێڵگەیەکی لە قەلاّی (شاری) أوکنیبا دایێ، پاشان ولو دوو گونیە گەنمی دایێ، ئەوجا ولو دیارییەکی دایێ و نیربی یش قبوڵی کرد.

(٢٧) هەندێ لە ئەندامەکانی بنەماڵەی ولو بۆ نموونە لەمانەی خوارەوە پێکهاتبوون

نەوەی یەکەم: نشوی کوڕی ار —شینی مێردی کوندوراتی کچی تواری.

نەوەی دووەم: وولو کوڕی بیهی — شینی کە نشوی بەخێوی کردبوو (تینی).

نەوەی سێیەم: هاشیب — تیلا کوری ولو و براکانی.

نەوەی چوارەم: دانتی — شینی کوڕی هاشیب تیلا.

نەوەی پێنجەم: تیش — شیتایا کچی وانتی شینی

یلوا تیشوب بۆ مابووەوە، ئەو پاشایەش سەر بە ئیمپراتۆری میتانی (ساو ششتار sa-us-sa-t-tar) کوڕی (بارسا ستا Bar-sa-sa-tar) ١٤٤٠ پ. ز بوو، لـەم مـاوەیەدا کیرخـی

---

تۆمارگەی بنەماڵەی ولو کە بیّ تێکچوون مایەوە ١٣٩ پارچە (رقیم) بوو، هەندێکیان لەم شوێنانە پارێزرابوون.

- (٥١) پارچە لە هەردوو موزەخانەی عیراقی و بەریتانی پارێزراون و لەلایەن (Gadd)ەوە بڵاوکرانەوە.
- (٣٢) پارچە لە کۆمەڵەی یالّی The Babylonian collection Lacheman & owen بڵاوکرایەوە.
- (١٦) پارچە لە موزەخانەی لۆڤەر لە پاریس کە لە لایەن (contenau)ەوە بڵاوکرایەوە.
- کۆمەڵەی ئەرمیتاج و موزەخانەی پوشکین کە هەشتیان لە لایەن N. B. Jankowskaەوە بڵاوکرایەوە.
- (٣) پارچە لە لایبزگ کە لە گۆڤاری توێژینەوەی ئاشووری و شوێنەوار لە رۆژهەڵاتی نزیکدا بڵاوکراوە Zeitschrift für Assyriologie und vorderasiatische Archologic (Z. A), 42, LPs.
- کۆمەڵەی موزەخانەی کیلسی Kelsy کە سیانیان لەگەڵ کۆمەڵەی ولو و دووانیشیان لە لایەن contenau بڵاوکرانەوە. ساڵی (١٩٢٨ ز)یش owen دوانزەی (١٢) لیّ بڵاوکردنەوە.
- دوو پارچە لە Museum Royaux du Cinquatendire کە L. Seleer بڵاوی کردنەوە.
- لاخمان یەکیّ لەو هەشت پارچەیەی کە لە مۆزەخانەی بەغدای پاراستبوو لە ژمارە (٣٢)ی گۆڤاری سۆمەردا بڵاوکردەوە.

E. R. Lacheman, Tablets from kirkuk and nuzi in Iraqi Museum Quoted as Sumer, 32, no, 8.

ئەو هەولآنەی لەم پارچانەدا نووسراون پەیوەندییان بە یاسا مەدەنییەکان و مەسەلەی ژن و ژنخوازی و زەوی فرۆشتن و وەرەسە دابەشکردن و چارەسەرکردنی مەسەلەی کێشە و گرفتەکانی وڵاتی ئەرابخاوە هەیە. هەموو ئەو ناوانەش کە لەم پارچانەدا تۆمارکراون حوررین.

سەبارەت بەو شتانەی لەم پارچانەدا هاتوون و دەقەکانیان بە ئینگلیزی بگەڕێرەوە بۆ:

K. Grosz, the Archive of the wallu family, Copenhagen, 1988.

لەگەڵ نیشتەنیەکانی دیکەی حوری وەك توزی و کورخانی[٢٨] لە هەرێمی ئەرابخا بەشێکی تەواوکەری ئیمپراتۆریەتی میتانی بوو کە لەسەر دەستی توێژی ئەریستۆکراتیی هیند و ئارییەکاندا دامەزرا.

---

(٢٨) شوێنی کورخانی لە باشووری رۆژئاوای کەرکوك لەلایەن دەسەڵاتی عیراقییەوە دۆزرایەوە و بە (تل الفخار) ناسرا.

دوکتۆر (یاسین محمود الخالص) لە بەرگی سێی گۆڤاری سۆمەر ساڵی ١٩٧٧دا وتارێکی بڵاوکردەوە بەناونیشانی (کوروخانی) و تیایدا ئاماژەی بەوە کردبوو کە ئەم گردە نزیکەی (٤٥) کیلۆمەتر لە کەرکووکەوە دوورە و (٣٥) کیلۆمەتریش لە (نوزی)یەوە.

لە پاڵ مۆرە لوولەییەکان کۆمەڵێ پارچە قوڕ (رقیمات الطین) دەرکەوت کە (٦٠٠) پارچەبوون و بابەتەکانیشیان بریتی بوو لە نامە و رێککەوتننامە و گرێبەست و قەرز و (معاملە) و بەڵگەنامە سەربارەت بە (التبنی)، پاشان کڕین و فرۆشتنی زەوی و ئاڵوگۆڕ و دەقی ئایینی و دادگایی و ئیداری و لیست بە ناوی ئەو کەسانەی کە دانەوێڵەیان قەرزکرد بوو.

ئەو زمانەش کە دەقەکانی پێ نووسرابوون حوری بوو، دەقی ئەو پارچانەش لە شێوازدا لە نووسینەکانی ناوەڕاستی سەدەی پازدەی پێش زایینی دەچوو کە لە کەرکوك و نوزیدا دۆزرانەوە.

(دکتور یاسین محمود الخالص) دەڵێ: ((ناوی کۆنی شوێنی –تل الفخار- یەکێکە لەو خاڵە گرنگانەی ((عبدالاله فاضل)) لێ کۆڵیوەتەوە، ئەو لەو بڕوایە دایە کوروخانی ناوی کۆنی –تل الفخار) بووە و ناوی کوروخانیش بە دوو شێواز لە دەقەکانی تل الفخار داهاتووە.

Urku – ur – ru – ha –an –ni

هەورەها:

Urkur – ru – ha – an – ni

پاشان دەڵێ:

((بەڵگەی شوێنەواریی بەهێز هەیە ئاماژە بەوە دەکا کە چینی دووەم لە کوروخانی و کۆشکە سەوزەکەی هاوچەرخ بووە لەگەڵ چینی دووەم و کۆشکەکەی لە نوزی. هەردوو کۆشکیش هەمان چارەنووسیان هەبوو بە سوتاندن و وێران کردن و رەنگە لە هەمان کات و بە دەستی هەمان دوژمنیش. هێرشی دەرەکی و وێرانکردنی کوشکی هەردوو نوزی و کوروخانی، لەوانەیە لە کردەوەی ئاشورییەکان بێ کە یەکێتی ((حوری – میتانی))یان لەم ناوچانەدا لەناوبرد، لەوانەشە ئەمە لەسەردەمی حوکمڕانی (أشور أوبلط) بووبێ ((١٣٦٥-١٣٣٠ پ. ز)).

ئەو هیند و ئاریيانەی کە لە نێوان حوریيەکان و کاشییەکان و کوتییەکاندا و لە چیاکانی زاگروس و باکووری دۆڵی دوو رووبارەکەدا لە هەزارەی سێیەم و دووەمی پێش زایین نیشتەجێ ببوون و هەموو هەرێمەکانی سوبارتۆیان کردە نیشتیمانی خۆیان و پاشا ((حوری))ەکانیشیان خستە ژێر رکێفی خۆیانەوە و بۆ یەکەمجار لە مێژووشدا بنەمای هیند و ئاری زمانی کوردی یان چەسپاند[29].

---

بگەڕێرەوە بۆ لاپەڕەکانی ٤٤-٤٧ لە بەرگی سێیەمی گۆڤاری سۆمەر.

میتانییەکان لەگەڵ خزمەکانیان —أنسبانهم- کە چینی باڵای کۆمەڵگەی کاشییان پێکدەهێنا لە بابل، بە کۆنترین شەپۆلی گەلە هنیدو – ئارییەکان دادەنرێن کە بەردی بناغەی نەتەوەی کوردیان دامەزراند لە ناوچەی حوریی باکووری دۆڵی دوو رووبارەکە. ژنە زانای روسی (یانکوفسکا) لە حاڵ و باری ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەم نیشتەنییانە و نیشتەنییەکانی دیکەی هەرێمی (ارابخا) کۆڵیتەوە و باسەکەی خۆیشی لێرەدا بڵاوکردەوە

Extended Family commune and Civil self –Government in Arrapha in the Fifteenth – Fourteenth century B. C Journal of the Economic and Social History of the Orient 12, 1969. pp. 233-282.

شایانی ئاماژە پێکردنە کە نیشتەنییەکی دیکە بە ناوی ullabae لە باکووری رۆژئاوای شاری دهۆك دۆزرایەوە کە برگەی یەکەمی ئەم ناوە لە ناوی (اولونوزی)ی دەکرد. ئەم ناوە لەسەر دەقێك نووسرابوو کە لە ٥٤ دێر پێکهاتبوو.

بگەڕێرەوە بۆ توێژینەوەکانی (بو سغیت) سەبارەت بەپشکنین (ملامرکە).

J. N. postgate, The Inscription of the Tigith- pileser III at Mial Merg, Sumer, 29919730, pp. 47-59.

پسپۆران پێشتر وای بۆچوون کە نیشتەنی (أوللوبای) دەکەوتە ناو سنووری وڵاتی (أورارتو) لە نێوان ناوچە بەرزەکانی رووباری دیجلە و چیاکانی ئەنتی تۆرۆس لە نزیك دیاربەکری ئێستا. بەڵام ئەم دەقە شوێنەکەی لە نێوان دهۆك و زاخۆ دیاری دەکا. هەمان ناو لە هەمان دەقدا جاروبار بەشێوەی (کور أوللوبە) هاتووە و ئەو زەوییانەی دەگرتەوە کە لە سنووری ئاشور تا زێی گەورە بوون. گومانیشی تێیدا نییە کە ئەم ناوە لە بنەڕەتدا حورییە و نیشتەنییەکەش لە پایتەختی میتانییەکانەوە (واشوکانی) نزیك بوو.

(٢٩) ئەگەر نامەی ئیمپراتۆری میتانی ساوششتار sausstatar ساڵی ١٤٢٠ پ. ز نێردرابێ بۆ پاشاکانی کەرکووك بڕوانە:

G. Wilhelm, Grundzugeder Geschichte und kultur der Hurriter Grundzuge, Band, 45, Darmstadt 1982 P. 140-141.

پاشان ئەو قەواڵە ئیدارییە رەسمییە لە ئەرشیفی کەرکوکدا دۆزرایەوە باسی مردنی باوکی ساوشتار ئیمپراتۆر بارساتاتار Pasatar ساڵی ١٤٤٠ پ. ز دەکا. بگەڕێرەوە بۆ هەر یەك لە:

E. A. Speiser, Jaos 49, 1929, P. 129 ff, K. Grosz, the Archive of the Wullu family, Copenhagen 1988, p. 11.

دەبێ بڵاوبوونەوەی هیندییە ئارییەکان لە هەرێمی ئەرابخا و کورداندنی حورییەکان لە وێ لە ماوەی نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پێش زایین روویدا بێ و زۆربەی ناوکانیش لای ئەمانە رەنگدانەوەی ئەریتە روحی و رەوشتیەکان بوو وەك Birta – Zana (نەوەی پاڵەوانەکان) و Sutt-uazza (سەرکەوتبوو بەسەر)، Rta – dhaman (وێڵ و شەیدای حەق)، Rtamna (راهاتووە لەسەر یاسا). ئاشورییەکان لە ماوەی هەزارەی یەکەمی پێش زایین دەیان ناوی لەم جۆرەیان لە تۆمارگەی پاشاکانی خۆیاندا تۆمار کردبوو وەك:

Artamna, Bardasua, Birya sura, Ksemasra, Purusa, Saimasura, Satawaza, Varddhasua, Viryasura.

هەروەها لە کوردستاندا پاشا هەبوون ئەم ناوانانەیان هەڵگرتبوو و لە پاشاکانی سەردەمی سەرجۆنی لە ئاشور یاخی بوون، لەوانە: ارتامنا، بارداشوا، بریاشورا، برزوتا، توناکا، شاتاوازە، ووریا سورا، واردلسفا و هەریەك لە کاکی و داتانا کە حاکمی هەرێمی خوبوشکیا بوون ساڵی ٨٢٨ پ. ز، و بریشاتی پاشای غیزیلبونده ساڵی ٨٢٠ پ. ز، بەهەر حاڵ برگەی دووەمی ژمارەیەك لەم ناوانە لەناوی خوای خۆرەوە وەرگیراوە کە نوزییەکان بەشێوازی سورا (Huraی کوردی) نوسیبوویان، لە کاتێکدا لە زمانە ئێرانییەکانی دیکەدا و لە دواییدا گۆڕا بۆ (اهوراهو یان خور). لەگەڵ هەموو کارتێکردنە هیندی – ئارییەکان بەسەرقۆناغی سەرەتاییەوە لە دروست بوونی زمانی کوردی زۆر لە پاشگرەکان و هەندێ وشەی حوریش تائێستا هەر بەکاردێ لەم زمانەدا:

## هاوچەشنەکەی لە کوردیدا

| پاشگری ناوو سیفاته حۆریەکان | ئەوەی وەك ئەو لە کوردیدا | ماناکە |
|---|---|---|
| -u- h= ahe | Run – ahe | رووناکی |
| meri – nni | -u- nn = nni | شەهامەت |
| kurda – ssi | (U – zzi بەشیوازی زازا) | کوردی |
| aye | Sawa – aye | ساکار |
| Ka | Pts- ka | چەپەڵ |
| Ale | Kus - ale | پارچەیێکی بچووك |
| Anc | Marr- ane | مەڕانە |
| Are | Kurdew - are | ژیانی کوردەواری |
| Band | Pes - band | پێش بەند |
| baz | Fel – daz | فێڵباز |
| Dar | Brin - dar | بریندار |
| Gar | Zerin – gar | زێڕنگەر |
| Kar | Kre – kar | کرێکار |
| Mand | Hos – mand | هۆشمەند (زیرەك) |
| Saz | Dan – saz | گۆرانی بێژ |
| -ati | Piyaw- ati | پیاوەتی |
| -ayati | Dost- a | دۆستایەتی |
| -eti | Diz- eti | دزیەتی |
| Alga | Alqa | ئەڵقە |
| Amurt | Mort | دارێکە لە کوردستان دەڕوێ |
| Ardi | Ardi | زەوی |
| arse, ars | Harze (harze –kar) | هەرزەکار |
| Aware | Away | ئەوێ |

| | | |
|---|---|---|
| هەتاو | Hataw | Ata- u/o |
| ئاوارە | Aware | Aware |
| ڕەنگی بۆر | Bowr | Bawr |
| برج – تاوەر - | Burg | Burg |
| دایك | Dada (≤ daya) | Dada |
| ئەدی – طبعاً- | edi | Edi |
| ئاسك | gazali | Gaz/ gaz- uli |
| حەڵوا | halua | Halulo- la |
| هەنوکە – ئێستا | Hanu- (hanika) | Ha- nu |
| خوڕ | Kur | Hur |
| کەوت | Kew -tin | Kew |
| کەڕەت | Kerre | Kuru |
| ئەوستوور | Lir | Liy |
| مان | Man | Man |
| مەلەوانی | Mele – wani | Muli |
| (-مهر- موهبە) بەهرە | Nigari | Nig - ari |
| پرد | Pir | Pil |
| چاڵ | Qult (qurt) | Qult |
| شاڵ | Sari | Sari |
| ساڵ | Sal | Sauala |
| شێ (رطوبة) | Sey | Seya |
| ژیر | Zir | Sir |
| خۆشەویستی | Tadarak | Tadarak |
| تەڕایی | Tarra- yi | Tarmani |

یەکێ لە خواوەندەکان لە نوزی

هەورەها نامەیەك لە نامەکانی ئیمپراتۆر (ساوششتار)ی میتانی —سەدەی پازدەی پ. ز- دۆزرایەوە کە ناردبووی بۆ نوێنەرەکەی —عامل- خۆی إتخیا (إتخی تیلا) پاشای شاری نوزیی حوری لە خوارووی کەرکووك و بە مۆری خۆیشی مۆرکرابوو.، ئەم نامەیەش لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری بەڵگەنامەی رەسمی گرنگدا دۆزرانەوە کە دەیان ناوی زاگرۆسی (کوتی و حوری) و هیند و ئاریی دانیشتووانی ئەم شارەی تێیدا بوو[٣٠] تۆمارگەکانی قەڵای کەرکووکی حوری ئاماژە بەوە دەکەن کە —دیمتوکیرخی شیلواخا- ((قەڵای —حصن- شاری بەنی شیلوا)) چەند کۆگایەکی تایبەتی تێدا بوو بۆ هەڵگرتنی پێویستیی خواردەمەنی کە لای بابلییەکان بە (بیتاتو کوباتو —واتە کۆگای خۆراك- Store –vaults) ناسرابوو.

بەهەر حاڵ ئەرابخا لەگەڵ لوبدی (شارەبان و جەلەولا) لە هەزارەی دووەمی پێش زایینداً بەربەستێکی سروشتییان دروستکرد بوو لەبەردەم شاشینی کارودنیاشی کاشی کە لە بابل دامەزرا.

---

(٣٠) مۆری ئیمپراتۆری میتانی بە ناوی خۆیە نووسرابوو (ساوششتار کوڕی بارساشتاری پاشای میتانی).
((sa – us – sa – at- tar mar Bar – sa – sa – tar – sar Ma-i- ta-ni))
ئەم ناو و وشە حورییانە لە جۆری (حییات — حواء)، کوشوخ، شاووشکا، شیمکا، شوالا، تیشوب، تیلاتیری و هی دیکەش وەك ناوی پەرستراو —معبود- إیفخی، اراشخ (دجلە)، ئەرابخا، لوبدی، ماتکا، ناوار، نازو، سارا و هی دیکەش وەك ناوی تەبوگرافی. إیوری (پاشا)، بابنی (جبل) تیشنی (قلب —دڵ) و هی دیکەش وەك وشەی زمانەوانی. لەناو دەیان وشەی کوردی کۆندا دەتوانین ئاماژە بە هەندێ ناو بکەین لە جۆری ...pur(a) sa, suwar, zane هتد. وشەش وەك —أدی- ((بالتأکید))، أسپ، هەر (هەموو)، هیچ (أبدا)، کور و (هەموو جار) مێر Mer (پیاو) هتد.

کۆمەڵێ نەخش و کاری هونەری وڵاتی میتایین

دوای لەناوچوونی شانشینی میتانی و دابەشکردنی سوبارتۆ لە نێوان پاشاکانی ئاشوری و کاشییەکاندا ئەرابخاو (دیمتوکرخی شیلواخا) لە نێوان سەدەی سیانزە و دوانزەی پێش زایین وەك بەشێك لە تاڵانی و دەسکەوتی پاشاکانی ئاشور مانەوە و بە هیچ جۆرێکیش نەیاندەهێشت خەڵکەکەی بەئاسوودەیی بژین، چونکە هەر جارێ کە بەوێدا تێدەپەرین جۆرەها باج و پارەیان دەخستە سەریان و باریان قورستر دەکرد.

دوای ئەوەی لە زێی بچووك پەڕیەوە (عددنیراری)ی دووەم (٩١١-٨٩١ پ. ز) لە ڕێی (کیرخی)[٣١] یەوە هێرشی کردە سەر وڵاتی نامری (ناوار) و ئەوەی ویستی بیکا لە کوشتن و تالآنی کردی. کیرخی لەگەڵ هەرێمی (أربخا) سەر بە ئاشورییەکان مایەوە تاکو میدییەکان Mede و (سگز Scyth) دوای ڕووخانی نەینەوا ساڵی ٦١٢ پ.ز هاتنە ئەوێ و پتایدا نیشتەجێ بوون و بە تێکەڵ بوونیان لەگەڵ کۆمەڵگا ئارییەکانی سەردەمی میتانی کە بوونە هۆی گۆڕینی ڕەواڵەتە ((أثنی))یەکان -ڕەواڵەتە نەتەوەیەکان-ی حورییەکان، میدییەکان و ((سگز)) بەیەکەوە بنەمای زمانەوانی و ڕەگەزی کوردیان بەرجەستەکرد، ئەو بنەمایانەی هەر لە سەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زایینەوە لە خاکی سوباردا دەستی بەدەرکەوتن کرد.

بەم پێیە هەر یەك لە ئاشور و أوربیلوم و أربخا لەگەڵ شاری کیرخوا (کیرخی) و هەموو ئەو ناوچانەی دەکەوێتە بەری ڕۆژهەلآتی ڕووباری دیجلەوە بوون بە بەشێك لە وڵاتی میدیا.[٣٢]

پاشان بەپێی ڕێکخستنە ئیدارییەکە بوون بە یەکێك لە (ساترابات - هەرێم - ناوچە - مقاطعة)ی دەوڵەتی ئەخمینی. بە گوێرەی ڕێککەوتنی سەربازی نێوان کەیخسرەو Kai Xsura (پاشای مەزن) و (نیوخذنصر)ی کلدانی، سەرکردەکانی هۆزەکانی (سگز) کە لەگەڵ ئاشورییەکاندا هاوپەیمان بوون و پێشتر لە وڵاتی (ماتنا)

---

(31) C. J. Gadd, Revue d'assyriologie erd' archeologie orientale (R. A) Subartu, Beitrage Zur Kulturgeschichte und XXIII, p, 46, Ungnad volkerkunde vorderasiens Berlin – Leipzing 1963 p. 116, th Dangin, RA , XXVII, P. 13.

(یاقوت الحموی) ساڵی ١٢٢٨ ز ناوی کەرکووکی بەشێوەی -کرخینی- تۆمارکردبوو.

(٣٢) بگەڕێرەوە بۆ کتێبی ئەناباسیس (ڕوو کردنەناوەوە)ی سەرکردەی یۆنانی کسینوفون Xdvoøov, AvaBaotC III. 5. 15. 17. ئەرنست هرتسفلید ئاماژە بەوە دەکا کە ڕووباری دیجلە هەر لە (بتلیس چای) تاکو دیالە و ڕووخانی نەینەوا تا ڕووخانی بابل بە دەست کورشی ئەخمینی ساڵی ٥٣٩ پ. ز سنووری ڕۆژئاوای ئیمپراتۆرییەتی میدی پێکدەهێنا. بگەڕێرەوە بۆ E. Harzfeld, the Persian Empire, Wiesbaden 1968, P. 301.

ولایەتی کوردستان –سنندج-ی ئێستا ئێران نیشتەجێ بوون، ناچار کران لە شارێکدا نیشتەجێ بن کە لە دواییدا بە ناوی تیرەگەری خۆیانەوە ناونرا (سگز –سەقز-).[٣٣]

---

(٣٣) (سکیث)ەکان لە ولاتی خۆیانەوە کە بە (سکیثیا) ناسرابوو کۆچیان کرد. گریکەکان ناوی سکیثیا Skythia (ولاتی –سگز-) بۆ ئەو دەشتانە بەکاردەهێنا کە دەکەوتنە باکووری دەریای رەش و لە (کرباثیا) دەکشا لە یۆگسلافیا و بە باکووری بولگاریادا تێدەپەڕی تاکو رۆخی رۆژهەلاتی رووباری دۆت.

لە کاتێکدا ناوەڕاستی ئاسیا بەتایبەتی ناوچەکانی باکووری بە (سکیثیا)ی رۆژهەلات ناوبانگی دەرکرد دەربارەی درێژەی ئەم بابەتە تەماشای ئینسکلۆبیدیای بەریتانی بکە، بابەتی Scythia. لە هەزارەی یەکەمی پێش زایینی ژمارەیەکی زۆر لەمانە بەرەو کوردستان هاتن، یەکەم هەواڵی نووسراو سەبارەت بەمانە لە تۆمارگەکانی (اشور ناصربال)ی دووەم هاتووە کە لە چارەکی نیوەی دووەمی سەدەی نۆی پێش زایینی ژیاوە بڕوانە:

T. Cuyler. Young, JR. 'The Iranian Migration into the zagros' Iran journal of British inst. Of Persian studies, vol. v. (1967), p. 20.

هەروەها بڕوانە:

T. sulimirskli 'skythian Antiquities in western Asia' 17, (1954) PP. 290-293.

دوای (اشور ناصر بال) ئاشورییەکان ئەم هۆزەیان بەناوی (إشکوزای) و (کیمیرای) ناسی. لەوەش دەچێ کاتێ کە لە بەشەکانی رۆژهەلاتی ئاسیای بچووك نیشتەجێ بوون بە دوو لادا بلاوبوونەوە: بەشێکیان لە ئەنەدۆڵ و بەتەنیشت (سینوب) لەسەر ناورێژی رووباری (هالیس) بۆ ماوەیەك مانەوە، بەشێکی دیکەیان وەك گریشمان دەڵێ روویان کردە رۆخەکانی دەریاچەی ورمێ

R.. Ghrishman, Iran. L. 195, P. 93.

کاتێ کە کاروباری شانشینی ماننای کوتی لە باشووری دەریاچەی ناوبراو لە نێوان سالانی ٦٦٠-٦٥٩ پ. ز ئالۆز بوو راپەڕینێك دژی بنەماڵەی فەرمانڕەوا روویدا و لە ئەنجامدا (لخشیری) کوژرا و کوڕەکەشی پەنای بردەبەر ئەینەوا، ئەمەش رێی بۆ (سکیث)یەکان خۆش کرد کە ئەوانیش هاوکاریی ئاشوورییەکانیان دەکرد بەرەو ناو شانیشینی ناوبراو کۆچ بکەن و بەرەیەك لەگەڵ سنووری دەسەلاتی میدی بکەنەوە کە لە هەمەدان جێگیر بوون. لەو زەوییانەی ئێستا نزیکە لە سنووری عیراق و ئێرانی ئەمڕۆ (سکیث)ەکان بنەمایەکی ئاساییان دامەزراند کە چارەکە سەدەیەك مایەوە وەك

هەروەها پیاوماقوڵانی شانسینی یەهودا و سەرکردەکانی بەنی ئیسرائیلیش کە خۆیان و پێغەمبەرەکانیان لە بابلییەکان یاخی بوون، ئەوانیش ناچارکران لە قەڵای کەرکووك و نشینگەکانی دەوروبەریدا نیشتەجێ بن.(٣٤) بەم پێیە وا دەردەکەوێ کە

---

هیرۆدۆت دەڵێ کە رووخانی ئەم بنەمایە بە دەست میدییەکان بەمجۆرە راڤە دەکا کە (کی اکساریس) سەرکردەکانی (سکیث)ی بانگکرد بۆ نان خواردن. زۆربیان خواردو و خواردەوە تا سەرخۆش بوون، پاشان هەموویانی کوشت، بەمجۆرە میدییەکان شانشینی خۆیان پاراست. پاشماوەی (سکیث)ەکان گەڕانەوە وڵاتی خۆیان لە (لیسهول) کە دەکەوێتە رۆخی دەریای رەش لە باکوورەوە) بڕوانە هیرۆدۆت و مێژوو فەسڵی یەکەم ل ١٠٦ و دوای ئەو.

(٣٤) کەرکووکییەکان لەو بڕوایەدان کە لە ناو دیلە عیبرانییەکاندا کە لە قەڵاکەیاندا نیشتەجێ بوون کاهینە پێغەمبەرەکان دانیال و عرزا و حنانیا هەبوون، بەڵام لەڕاستیدا ئەمانە بەیەکەوە لە کەرکووکدا نەبوون لە یەك کاتدا. چونکە (بنوخذ نصر) دیلە جولەکەکانی لەنێوان ساڵانی ٥٩٨، ٥٨٧ پ. ز بردە بابل و لەوێ نیشتەجێی کردن. لەنێوان دیلەکانی گرووپی یەکەم پێغەمبەری کاهن حزقیا هەبوو کە بۆ ماوەی چل ساڵ لە بابلدا مایەوە. لە فەسڵی یەکەم تا فەسڵی شەشەمی بەشی سێیەمی عەهدی کۆن —العهد القدیم- هەواڵی پێغەمبەرایەتی دانیال و هاوڕێکانی لە ژێر دەسەڵاتی (بنوخذ نصر) ٦٠٥-٥٦٢ پ. ز و (بلشاصر) و هەریەك لە کۆرشی دووەم (٥٩٩-٥٣٠ پ. ز) و دارای یەکەم (٥٢٢-٥٣٠ پ. ز) ئەخمینی دا دەخوێنینەوە. هەروەها هەواڵی دیکەش هەیە سەبارەت لەسەر تەخت دانیشتنی داریوش. دانیال لەسەرەتا لە کۆشکی (نبوخذ نصر) کار و خزمەتی کردووە، واتە لەسەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زایین، بڕواش ناکەین ئەو گرتنی بابلی دیتبێ لە لایەن کۆرشەوە ساڵی ٥٣٩ پ. ز.

ئەمە و لە کاتێکدا عزرا دوای ئەو بەسەدەیەك ژیا لە نێوان سەدەی پێنجەم و چوارەمی پێش زایین. و بەیەکێك لە ئیمامە (أئمە) بەناوبانگەکانی میللەتی خۆی دادەنرا، کە گەڕاشەوە ئۆرشەلیم بە فەرمانی ئەخمینییەکان، لەوێ بەناوی باوکی جولەکایەتی ناوی دەرکرد، یان موسای دووەم چونکە دووبارە تەوراتی نووسییەوە (پێنج کتێبەکەی عەهدی کۆن). لەو نووسینەوەدا شێوازی نوێی ئایینی یەهودی دارشت —لە هەردوو (سفر)ی عزرا و نحمیای کتێبی پیرۆز ئاماژە بەوە دەکرێ کە عزرا لە

کۆمەڵە هیند و ئێرانییەکان لە خەڵکی سگز Scyth کە هاوپەیمانی ئاشورییەکان بوون، توانییان تەگەرە بخەنە بەردەم هێرشی میدییەکان و بابلییەکان، کە لە تەوەرەکانی -محور- ((کوتیوم - أوربیلوم))ەوە هێرشیان کردەسەر نەینەوا و پاشانیش لە دوای روخانی پایتەختی ئاشورییەکان و بە فەرمانی میدییەکان لەو دوو هەرێمەدا نیشتەجێ بوون، سەرەڕای ئەوەی دارای ئەخمینی مـــاوەیەکی دواتر بەردەوام بوو لـــە

---

حەوتەم ساڵی فەرمانڕەوایەتی أرتخشیر (أردشیر) گەیشتەوە وڵاتی خۆی. ئاشزانین ئەم ئەردەشێرە کێیە، رەنگە ئەوە بێ کە کسینوفون ساڵی ٤٠١ پ. ز لە شەڕی کوناکسای نزیك فەللوجە دیتبووی (بگەڕێردوە بۆ ئەناباسیس) بەڵام راستییە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ماوەی فەرمانڕەوایی یەهودا لە لایەن عزراوە دەکەوێتە پێش سەردەمی فەرمانڕوایی (نحمیا) کە لەنێوان ساڵانی ٤٤٥-٤٣٣ پ. ز بوو. ئەردەشێری دووەمی ئەخمینیش لە نێوان ساڵانی ٤٠٤-٣٥٨ پ. ز فەرمانڕەوایەتی کردووە، واتە دوای فەمانڕەوایەتی (نحمیا) بە نزیکەی نیو سەدە، بۆیە دەبێ عزرا لە کۆتایی ماوەی فەرمانڕەوایەتی (نحمیا) گەیشتبێتە ئۆرشەلیم و رێ پێدان -اجازە-ی رەسمی پێ بووبێ کە لە لایەن ئەخمینییەکانەوە پێی درابوو و تیایدا دانی پێدانرابوو وەك نووسەری یاسای خوای جیهان یان وەك سکرتێری شاهانای کاروباری ئایینی بۆ ئەو جولەکانەی لە رۆژاوای رووباری فوراتدا دەژیان. لەم کاتەدا فیگەری یەهودی کە لە شارەزایی حزقیالدا خۆی دەنوێنێ، دەرکەوت، حزقیال یەکێ لەو پیاوانە بوو کە (نبوخذ نصر) لە کۆمەڵە دیلی یەکەمدا گرتبووی. لە واقیعیشدا دەبێ لە هەموو (أسفار)ەکانی پەیمانی کۆن بکوڵێنەوە چونکە جولەکە تەنها دوو شتی پێشکەش بە شارستانییەتی جیهانی کۆن کرد، کە بەڵگە مێژووییەکان سەلماندیان کە هەردووکیان رەسەن نین، ئەو دوو شتەش پەیمانی کۆن بوو کە ورد ئەبوو لە لایەن رووداوە مێژووییەکانەوە و زۆر لە هەواڵەکانیش لە ئەدەبی گەلانی دۆڵی دووررووبارەکە و میسر و کەنعانییەکانی سویاوە وەرگرتبوو، دووەمیش بڕوای جولەکە بوو کە تێکەڵەیەك بوو لە ئایینی حوری و میسری و ئاری و بابلی.

بۆ زیاتر زانیاری پەیدا کردن بگەڕێردوە بەشی سێیەمی کتێبی ئێمە (رۆژهەڵاتی کۆن) بەغدا ١٩٨٨ کە بە هاوبەش لەگەڵ دوکتۆر (سامی سعید الاحمد) دانراوە.

لە ژیانی ئاسایی لە کوردستان لە سەدەی
سێزدەی پێش زایینی لە پەرداخە زێڕینە
دۆزراوەکان لە — حسانلو — مۆزەخانەی تاران

هێرش کردنە سەر فیدراسیۆنی هۆزەکانیان لە ئەنەدۆڵ و بەلقان و تا باشووری روسیا[٣٥].

---

(٣٥) دوای تێکشکانی هێزەکانی شانشینی مانتاکە کوتییەکان لە ناوچەکانی سەرچاوەی زێی بچووك دایانمەزراند بوو و داوی ئەوەش کە میدییەکان بوونە هاوپەیمانی ئاشوور بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بابلییەکان لە شەڕی (کابلینا) لەسەر ڕووباری فورات، میدییەکان و دوای ئەوەی سەرکردەکانی (سکیث)یان لەناوبرد وەك باسکرا، چوونە ناو وڵاتی مانناوە، لەم ماوەیەدا و لە تەوەری (أتروباتینا) —ئازربایجان- هیچ ڕێگرێك نەما ڕێ لە هاتنی هۆزەکانی (سکیث) بگرێ بۆ دەشتی هەولێر و پاشان بۆ کەرکووك. ئەم هۆزانە تەوەری ئەغەدە —شنۆ- سەردەشت — کوێسنجاق یان بەکارهێنا بۆ ئەوەی بگەنە ئەو شوێنەی دەیانەوێ. بە گوێرەی زانیاریەکانی ئێمە پاشماوەی (سکیث)ەکان لە دەشتی

دوو جەنگاوەری میدی شەڕ لەگەڵ دوانی (سکیث)دا دەکەن

کاتێ کە هێزەکانی (مقدونیا) بیابانی سوریایان بری و لە نزیك پیشخابور (فیشخابور) لە ٣٣١-٣٣٠ پ. ز، لە دیجلە پەڕینەوە، ئەلیکساندەری مەقدونی بەرەو (Gaugamela Gamela .gvgmal<gan الارامی = تل جومل) ڕۆیشت تاکو لەوێ ڕووبەڕووی داریۆشی سێیەمی دوژمنی ببێتەوە، بەڵام داریۆش شەڕەکەی بەجێهێشت و پەنای بردە بەر چیاکانی کوردستان لە باکووری ئێران.

دوای ئەوەی ئەلیکساندەر لە ڕووباری زێی بچووك پەڕییەوە لە سەرچاوەی نەوتی أرابخا نزیك بووەوە. لێرەدا نووسەری یۆنانی بلوتارخ[٣٦] ئاماژە بەوە دەکا کە (ئەلیکساندەر دوای شەڕی gaugamela نزیك ئەربیلا لە ڕێی (أرباخی)یەوە Arpahi (لێرەدا مەبەستی أرانجی یان أرابخایەکە بطلیموس بە شێوازی Arrhapa) دایڕشتبوو، بەرەو بابل ڕۆیشت و لەوێش قەڵاکەی چاك کردەوە (واتە قەڵای کەرکوك) پاشان دەڵێ (لەسەر خاکی ئەرباخی ئاگری هەمیشەیی دەبینی کە ڕووباری نەوت دایدەپۆشێ) ئەم قسەیەش بە

---

هەولێر بەزاکروتییەکان (کە بەشێکن لە میدییەکان) دەگەن، زاکرتییەکان پێش ئەوان لە دوای ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتی ئاشورییەوە لە دەشتی هەولێر نیشتەجێ بوبوون. لە نێو چینی ئەریستۆکراتی ئەماندا دوو بنەماڵەی شاهانە ناوبانگیان دەرکرد و ئەندامانی لەسەردەمی (الفرثی)دا حوکمی هەولێر و کەرکوکیان کرد.

(٣٦) بگەڕێرەوە بۆ: بلوتارخ، ژیانی ئەلیکساندەر Plutarch, Alex, 35.

تەواوی شوێنی ئێستای (عرفە) دەگرێتەوە. شوێنی باوەگوڕگوڕیش کە بلوتارخ ناوەکەی بەشێوەی کورکورا Koroura دەنووسێ کە لەگەڵ أرباخیدا بەشێك لە (ساتراب – هەرێم، بەش)ی میدیا پێکدەهێنن، میدییەکانیش لە کۆتایی ناوەکەدا پاشگری زاگرۆسی ناوخۆییان پێوە لکاند ak-uk بەجۆرە ناوەکە بوو بە کەرکووك[۳۷] ( korkour-uk or korkour-ak) بۆیە ئەم ناوە پەیوەندیی بە ناوە ئارامیەکەی (کرخابیث سلوخ) شارەکەوە نییە وەك هەندێ نوسەر بۆی دەچن. شایانی ئاماژە پێکردنە کە (بطلیموس) شوێنی نیشتەنیی ئارانجییەکانی لە کۆتایی هەزارەی یەکەمی پێش زایینییدا لە باکوری (دیمتو – قەڵاکە-) دەست نیشانکردبوو.

جا ئەگەر شاری کورکورك (کەرکووك) لە سەدەی حەوتەمی پێش زایینییەوە بووبێت بە مەڵبەندێ لە مەڵبەندەکانی (ساتراب میدیا) کەواتە دەبێ (الآسکیث –سکس)[۳۸] لەم

دووسوارە لە هۆزی سکاکا

(السکیث)

(۳۷) ئەم پاشگرە هەندێ جار ka-یان ku دەچێتە سەر ناوە ئێرانییەکان لە جۆری Arstaka, Artuka, Baguka, Mazdaka, Xsarka, Arsaka, pahyauku.

(۳۸) (سکیث)ەکان خزمایەتییان لەگەڵ (فرث)یەکاندا هەبوو، ئەو (فرث)یانەی دەسەڵاتی سلوقییان لە عێراقدا کۆتایی پێ هێنا، ئەمانە لە وڵاتی (سکیثیا) و (خوارزم)ەوە و لە دوو ماوەی جیاوازدا هاتنە دۆڵی دوو رووبارەکە.

بگەڕێرەوە بۆ بابەتی بنەچەی (اللان) لە مێژوودا لە (سکیث) و (الکیمیرین) و (السرمات). لە بەشی سێیەمی کتێبەکەی ئێمە (لقاء الاسلاف) لە ندەن ۱۹۹٤ ل ۱۰۷-۱۳۹.

نەخشێ لەسەر پەرداخێ لە زیویە دۆزرایەوە رێ و رەسمی پێشکەش کردنی هەندێ دیاری بۆ
پاشای (ماننا) پیشاندەدا (سەدەی حەوتی پێش زایینی) لە هونەرەکانی کوردستانی رۆژهەلاّت (مۆزەخانەی لۆڤەر)

ماوەیەدا و بە فەرمانی میدیەکانی لەم شارەدا نیشتەجێ بووبن و تێکەلّ بوون و یەکگرتن رۆشنبیری لە نێوان ئەم دوو نوێژەی نیشتەجێ بووەکاندا کارێکی سروشتی بوو، چونکە هەردوو لایان لە بنەڕەتدا لە هەمان رەگەز و زمان بوون.

دوای دەرکەوتنی دیاردە و رەوالّەتە زمانەوانییەکان لە هەزارەی دووەمی پێش زایینەوە، کە کەوتبوونە بەر کاریگەریی وشە و پیتە هیند و ئارییەکان، دوای دەرکەوتنیان لەم نیشتەنییە حوری —میتای-یە کۆنەدا کە کۆنترین بنەمای زمانی کوردییان دانا، لە دواییدا تێپەڕبوونی هەزار سالّ رۆشنبیریی ئێرانی کاری لەم بنەمایەکرد و شێواز و بناغەی رێزمان و (صرف)ی زمانەکەی دیاری کرد.

دەبێ ئەم دیاردەیە بۆ یەکەم جار لە سەردەمی میدییەکاندا بلاّو بووبێتەوە و زالّ بێت و پاشانیش لە سەردەمی (الهللینی)یەکاندا پوختە و کاملّ بووبێت. هەر لە سالّی (١٢٨ پ. ز)یەوە لە هەرێمی ئەرابخا شانشینێك دروست بوو کە بنەمالّەی (إیزدین)ی (سکسی).

کۆمەڵەی دانیشتوانی میدیا (هەڵکەنراوی ئاشوری)

سەرکردایەتی دەکرد و ناوچە گەرمە باشورییەکانیشی لەم ماوەیەدا بە ناوی (گرمکاف Garmakan) -گەرمیانی کوردی- ناوبانگی دەرکردبوو، کە لە دواییدا لە عەربی بوو بە (جرمقان) (جارامیقا أو جرمیق). ناوچەی ناوەڕاستە فێنکەکانیشی کە کەرکووك مەڵبەندی ئەو ناوچانەی پێك دەهێنا و لای سریانەکان بە ناوی Bêgermê ناوبانگی دەرکرد، ناوی (شهرا – زور)ی لێنرا بۆ بەرز ڕاگرتنی ئازناوی چەند پاشایێکیان کە بە شێوازی (شهرا- یان شهرات) ناوبانگیان دەکردبوو. یەکێك لەو پاشایانە شاری (شهرا کرت Sahra – kart)ی لەسەر زێی بچووك دروستکرد کە لای کورد بەناوی پردێ Pridê (پرد) ناسراوە و ئارامییەکانیش بە شێوەی (شهرقذ) لە (شهراکرت)ەوە تۆماریان کرد. پاشان عوسمانییەکان وای بۆچوون کە زاب گۆڕانێکی کوردییە بۆ وشەی (ذهب – ئاڵتون-ی)ی عەرەبی، بۆیە بە هەڵە شارەکەیان ناونا ئاڵتۆن کوپری (القنطرة الذهبیة).

ئارامییەکانیش هەرێمی Garmakan (بیث گرمای) یان کە لە عەرەبیدا بوو بە (باجرمی)، جارێ بەم ناوەوە ناونا، جاری دیکەش بە ناوی (شهر زفر یان سیار زور)

ناویان دەبرد. سریانەکانیش بە (شهر زفر) وەریانگێڕا، بەڵام بیزەنتییەکان مەڵبەندەکەیان هەر بە ناوی ( Chalchas Toilzdem = Xa Axao Toi IÇash) (قلعه بيت إيزدين)[٣٩] کە لە جیاتی ناوە حورییەکە (دمتوکیرخی شیلواخو) (قلعه بيت مدينه بني شيلوا) واتە قەڵای ماڵی شاری بەنی شیلوا بەکاردەهێنا و جێی ئەوی گرتەوە، جا ئەگەر شا ژنە هەولێری —الملکه الاربیله- هیلینا و برا و مێردی لە هەمان کاتدا شامونوباز کە هەر دووکیان بت پەرست و —سکس-ی بوون و لەم ماوەیەدا بووبن بە جولەکە —ئایینی جولەکە- و منداڵەکەشیان ناو نابێ إزاتیس (عزه) کە لە دواییدا بوو بە نازناو بۆ زۆربەی شاکانی Adiabênê کە لە ئۆرشەلیمدا نێژران[٤٠]، بەڵام بنەماڵەی ئیزدین کە بەشدارییان کرد لە بەهێز کردنی مەرجەکانی نەتەوایەتی کورددا، داب و نەریتی مەزدی ئێرانی Mazdaizim خۆیان پاراست، ئەو نەریتەی خوایەتی لە رووناکی ئاسماندا بەرجەستەکرد، بەڵام هەر لەگەڵ سەدەی یەکەمی زایینیدا ئەم دوو بنەماڵە شاهانەیە داب و نەریتی ئایینی بت پەرستی و جولەکایەتی کۆنی خۆیان وازلێهێنا و مەسیحییەتیان کرد بە ئایینی رەسمیی دەوڵەت،

---

(٣٩) دەبارەی رەگی کۆنی ناوی شارەزوور بگەرێرەوە بۆ توێژینەوەکانی (ارنست هرتسفيلد).
E. Herzfeld, The Persian Empire, Wiesbaden, 1968.

(٤٠) هیلینا ساڵی (٥٠) زایینی لە ئۆرشەلیم نێژرا پاش ئەویش هەر یەك لە مونوباز و (عزة الاول) نێژران.

سەبارەت بەم بابەتە بگەرێرەوە بۆ کتێبی جەنگی جوولەکە —الحرب اليهوديه-ی (يوسف الفلاوی)
Josephus, Ant, Jud, XX, 35 and
Bell, Jud V, p. 253.

بە گوێرەی توێژینەوەکانی Koshaker ژن و ژنهێنان لەناو ئەندامانی یەك خێزاندا لای (سکس)ەکان باوبووە، هەروەها لای میدییەکانیش لە ئەراخا (بگەرێرەوە بۆ ئەرنست هرتسفيلد). زۆربەی پاشاکان خوشك یان کچی خۆیان دەخواست. شایانی ئاماژە پێکردنە کە ئەم نەریتە لەناو فیرعەونییەکان و پاشاکانی (-حیثیەکان- و- فرث-یەکان و ساسانییەکاندا و زۆربەی کۆمەڵگە کۆنەکاندا باوبووە.

لەم بەشەی میدیا کە لەو ساوە بە (شارەزوور) ناوبانگی دەرکرد و کەرکووکیش بوو بە مەڵبەندی کۆنترین مەترانییەت (مطرانیة) نەك لە میدیا بەتەنها بەڵکو لە هەموو رۆژهەڵاتدا. لەناو پیاوە ناودار و ناسراوەکانی کوردیشدا (أسقف)ی واهەڵکەوت کە زۆر بە دڵسۆزی کەنیسەی مەسیحییان خزمەت دەکرد وەك (بارشبا)ی شارەزووری و (یعقوب لاشوم) و (الجاثلیق صبریشوع) کە لە ناوچە شاخاوییەکانی شارەزووردا شوان بوو، پاشان بوو بە (أسقف)ی کەنیسەی لاشوم (لاسین) نزیك داقوق لە خوارووی کەرکووك، (نرسی) کە لە (شهر قذ —النون کوبری) لەدایکبوو. هەروەها سەرۆکی هەموو کەنیسەکانی رۆژهەڵات (الجاثلیق شاهدوست) کە بە نازناوی (ناثنیال)ی شارەزووری ناوبانگی دەرکرد بوو شاپوری ساسانی ساڵی (٣٤٢ زایینی) لەگەڵ (١٢٨) کوردی دیکەدا لە سێدارەی دان، لەبەر ئەوەی لە ئایینی زەردەشتی هەڵگەڕابوونەوە، نووسەرەکانی سەردەمی ئیسلامی وەك (المسعودی) بە (الجرامقه) کە بە عەرەبکراوی (گرمکان)ە ناویان هێنا بوون.

ڕەنگە (توماس المرجی) دوا کەسی کوردە مەسیحییەکان بێ کە نووسینە ئایینییەکانی بۆ بەجێ هێشتبین. (توماس) لە ساڵی ٨٣٢ ز لە شارەزوور (شهرگان) لەدایکبووە و کوڕی یەعقوبە کەسەر بە هۆزی شێروانی (شارونایە) بوو لە ناوچەی ڕەواندز. لە پێشدا بە (أسقف)ی دێری نەستورییەکان —الدیر النسطوري- لە (بیث عبهی) کە یەعقوب لاشوم دایمەزراندبوو، دامەزرا، پاشان چووە مەرگە لە ناوەڕاستی کوردستان و لە دوایشیدا بوو بە (میتروبولیتان —مطرانیة-)ی (بیث گرمای) و لە کەرکووکدا نیشتەجێ بوو.

بەم پێیە و هەر لە سەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتی (سکس)ی مەسیحی، زمانی ئارامی بوو بەو زمانەی مەسیح پێغەمبەر و پاش ئەویش قوتابییەکانی بانگەشەی ئایینی مەسیحییان پێدەکرد، هەروەها بوو بە زمانی داب و نەریتە -الطقوس و المراسیم- ئایینییەکان لە کەنیسە و قوتابخانەکانی کەرکووکدا، هەموو ئەو بەرهەمانەی (مطران) و (اسقف)ـە بەناوبانگەکانی کەنیسە کوردییەکان دەیاننووسی بوون بە بەشێك لە کەلەپوری سریانی کە بە (وارث)ی شەرعی ئارامی دەناسرێ.

بەهەر حاڵ هەرێمی شارەزوور هەر لە سەردەمی هیللینیەوە بوو بە مەڵبەندی نیشتەجێ بوونی تایەفە کوردییەکان و پاشا ناوخۆییەکان فەرمانڕەواییان دەکرد.

پاشان کە رێکخستنی ئیداریی ئیمپراتۆرییەتی (الفرث) تێیدا زاڵ بوو و بڵاوبووەوە فەرمانڕەواکانیان نازناوی (شا)یان لە خۆنا.

دوای ئەوەی ئەردەشێری کوڕی بابك ی دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانی بەسەر ئیمپڕاتۆر ئەردەوانی پێنجەمی (فرثی)دا ساڵی ٢٢٤ ز سەرکەوت، کەوتە شەڕەوە لەگەڵ (کورتان شاهی مادیك) (مادیی پاشای کورد) نزیك کەرکووك لە هەرێمی شارەزوور. دەقە پەهلەوییەکەی کتێبی (کارنامج اردشیری بابکان) ئاماژە دەکا و دەڵێ (ئازاییەتەکە بۆ سوپا نەبەزەکە دەگەڕێتەوە کە چووە شەڕەوە دژی مادی پاشای کورد و خوێنێکی زۆر رژا و سوپای ئەردەشێر شکا)[41]. ئیتر هەر لە ناوەڕاستی سەدەی سێیەمی زایینیەوە هەرێمەکانی —مقاطعات- سەر بە شارەزوور و (بیث گرمی) —Beth Garme- کەوتنە ژێر دەسەڵاتی ساسانییەکانەوە کە کۆمەڵی لە ئەشرافی بنەماڵە (فهلیە) فەیلیەکانیان هێنا و لە قەڵای شارە سەرەکییەکەیدا (کرخا —کرخی-) نیشتەجێیان کردن، ئەو بنەماڵانە هەموو بەیانیەك کڕنوشیان —سجدە- بۆ هەتاو دەبرد، وەك لە تۆماری مەترانییەتەکەیدا نووسراوە. پاشان ئەم شارە بوو بە مەڵبەندی مانگانەی (مرکزاً شهریاً) ئاهەنگە ئایینییەکانی مەسیحی و لە دواییدا بە دیارترین مەڵبەندی مەسیحی لە جیهاندا دانرا، ئەوانەی پەیڕەوی ئەو کەنیسەیەیان دەکرد لەسەردەمی پێنجەمی زایینییەوە تووشی چەوسانەوە و زوڵمێکی زۆربوون و ژمارەیەکی زۆریشیان بوون بە قوربانی —ضحیة- سیاسەتی ئایینی یەزدەگردی دووەم (٤٣٨ ز- ٤٥٧ ز).

---

(٤١) لێرەدا دەقەکەی بە فارسی نووسیوە کە بە پێویستم نەزانی بیکەم بە کوردی.

بگەڕێرەوە بۆ وەرگێڕانی فارسی کتێبی (الکارنامك) بە توێژینەوەی ئەحمەد کسرەوی —بهمن ١٣٤٢- و وەرگێڕانی ئەڵمانی بە توێژینەوەی —ثتودور نولدکە-

Th. Noldeke, Geschichte des Ardachsir I papakan Gottingen 1879.

سەرەڕای تێپەربوونی کات و تەنانەت لەسەردەمی ئومەری و عەبیاسی و ئەیوبی و دوای ئەوەش، کە هۆزە تورکمانییەکانیشی تێیدا نیشتەجێ بوو لە سەدەی چواردەی زایینیدا و دوایش کە خرایە سەر دەوڵەتی عوسمانی لە دوای نەخشەکێشانی سنوور لەگەڵ ئێراندا لە سەدەی شازدەی زایینیدا، کەرکووك هەروەك مەڵبەندی ئیداری و ئابووری هەرێمی شارەزوور مایەوە[٤٢].

---

(٤٢) بەچاوپۆشی لە هۆکارە ئابوورییەکەی کۆچ کردنی هۆزەکانی میدی و ئەخمینی لە (خوارزم)ەوە بەرەو بەرزاییەکانی چیاکانی زاگرۆس، هاتنی (فرث)یەکان کە جۆرێکن (صنف) لە –سکس- لە وڵاتی (برثاوا) parthava (تورکمانیای ئێستا) بەرەو دۆڵی دوو رووبارەکە دوابەدوای رووخانی دوا قەڵای حوکمی مەقدۆنی بە دەستی ئەوان، هۆکاری سیاسی بوو پەیوەست بوو بە ستراتیجییەتی لەناوبردنی مەڵبەندی فەرمانڕەوایەتی سلوقی لە (المدائن) لەگەڵ ئەوەشدا پێویستیە ئابورییەکان هەمیشە هەر هۆکاری سەرەکی هێرشە رێك و پێکەکانی دانیشتووانی بیابانەقان و قرەکەی ناوەڕاستی ئاسیا بوو لە ((الهیاطلة –Haptalitias- القبائل السبعه) ئەم هێرشانەش بەردەوام بوون بە درێژایی ماوەی دەسەڵاتی ساسانی لە عیراق و ئێراندا.

بگەڕێرەوە بۆ (ارثر کرستسن) –ئێران لە سەردەمی ساسانییەکاندا- بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەم بابەتە:

A. christenen, Liran soule sasswudes, Copenhagen, 1936.

کاتێ کە –إبن فضلان- (احمد فضلان بن العباس بن راشد بن حماد مولی محمد بن سلیمان) وەك نوێنەری خەلیفەی عەبباسی (المقتدر بالله) بۆ لای پاشاکانی (البلغار) و (الصقالیه) لە سەدەی (١٠)ی زایینیدا، بە وڵاتی (الری) و ترکستاندا تێپەڕی، باری ئابووری و کۆمەڵایەتی زۆر خراپی هۆزە دەوارنشینە –البدو- تورکەکان کە لەو دیو رووبارەکە –وراء النهر- بە ناوی جۆراوجۆر ناوبانگیان دەرکردبوو، باسی کردبوو.

ئەم ماوەیە لەگەڵ یەکەم کۆچی تورکمانەکان بەرەو ئازربایجان دەگەڕێتەوە، کاتێ لە ترسی هێرشی (الغز – الأغوز-) رایان کرد، لەو سەردەمەدا ئەوێ بەدەست کوردە (رواد)یەکان بوو کە لەساڵی ٣٤٣ ك / ٩٥٤ ز لە تەبریز نیشتەجێ بووبوون و دەسەڵاتیان لە ساڵی ٤٦٣ ك / ٩٨٣ ز هەموو ناوچەکەی گرتبووەوە.

بگەڕێرێرەوە بۆ کتێبی (رحلة ابن فضلان بتحقیق زکی ولیدی طوغان)

Ibn Fadlan's Reisibericht (AKM, BD, XXIV, HF, 3) Ed Togan (Leipzig, 1939).

دەربارەی بابەتی (رداد)یەکانیش بگەرێرەوە بۆ کتێبی ئێمە (لقاء الاسلاف) چاپی لەندەن ١٩٩٤ ل ٢١٢ و دوای ئەویش))

ولاّتی خوراسان کە لە سەدەی دە دا و لەسەر دەستی بنەماڵەی سامانیدا بوژایەوە، هەروەها ئازربایجان و کوردستانیش لەسەر دەستی (رواد)یەکان و (مروان)یەکان و (شداد)یەکاندا لەرووی رۆشنبیری و سیاسی و ئابوورییەوە، ئەمە بووە هۆی ئەوەی هۆزە دەوارنشینەکانی ئاسیای ناوەند جارێکی دیکە چاوی لێ ببڕن و هێرشی بکەنە سەر. ئەوە بوو لەسەرەتای سەدەی سیانزەی زایینیدا مەغۆلەکان گەیشتە ئامەد (دیار بەکر) و هەرچی کوردی تێیدابوو سەریان بری، پاشان روویان کردە ماردین و نوسەیبین و هەموو شتێکیان بۆ خۆیان حەلاّڵ کرد لە کوشتن و تالاّن کردنی ژن و ماڵ. لە نێوان سالاّنی ١٢٣٥-١٢٣٦ زایینیدا جارێکی دیکە هێرشیان کردە سەر باکووری کوردستان پاشان لە ساڵی ١٢٤٧ی زایینیدا روویان کردە باشوور و شار و گوندەکانی شارەزووریان تالاّن کرد و لە ساڵی ١٢٥٢ ز جارێکی دیکە هێرشیان کردە سەر دیاربەکر و دەوروبەری.

کاتێ هۆلاکۆ لە بەغدا کشایەوە بەرەو تەبریز ساڵی ١٢٥٨ پێویستی ئەو بۆ ئازوقە و خۆراك وای لێکرد پیاوەکانی بنێرێ بۆ تالاّن کردنی ولاّتی کوردان کە بە دانەوێڵە ناوبانگی دەرکردبوو وەك هەکاری، دیاربەکر، جزیرە بۆتان، ماردین.

لەگەڵ دەسپێکی ساڵی ١٣٩٣ ز تەیموری لەنگ هاتە کوردستان و کوڕەکەی نارد بۆ تالاّن کردنی دیاربەکر، ماردین، (طور عابدین) و (حصن کیف)، پاشان خۆی بەرەو باشوور کشا و هەولێر و موسڵ و جزیرەی لە ساڵی ١٤٠١ ز داگیرکرد و هەندێ لە پیاوەکانی لە تورکمانەکان لە هەکاری نیشتەجێ کرد تاکو رێگەی بازرگانیی نێوان حەلەب و تەبریزی بۆ بپارێزن.

پێش ئەوەی لەگەڵ پیاوە تورکمانەکانیدا بەغدا داگیر بکا کەرکوکی تالاّن کرد و هەندێ لە رەواڵەتە دیارەکانی وێران کرد، ئەمەش لە لاپەڕە ٤٩٥-٤٩٩ بەرگی (٢٠)ی ئینسکلۆپیدیای تورکیدا Turk Ansiklopedisi چاپی ئەنقرە ١٩٧٢ باس کراوە.

بێگومان بەشێ لە هێزە تورکمانیەکانی لە کاتی گەڕانەوەیدا لە کەرکوك هێشتنەوە، ئەمەش یەکەم دیاردەی بوونی تورکمانە لە نیشتمانی کورددا، بەلاّم بارودۆخە سیاسییەکە هیچ رەحمێکی پێ نەکردن بە هۆی پەیدابوونی ململانێی مەزهەبی لە نێوان عوسمانییەکان و سەفەوییەکاندا لەم ماوەیەدا.

پاشان کە دەسەلاّتی عوسمانییەکان لە نێوان سالاّنی ١٣٧٨-١٥٠٢ زایینیدا جێگیر و بەهێز بوو لە ئەنەدۆڵدا. ساڵی ١٤٦٩ ز رووبەڕووی دوو هێز بووەوە لە کوردستان و ئازربایجان، ئەو دوو هێزەش بریتی بوو لە یەکگرتنی هۆزەکانی (قرە قونیلو)ی شیعەی تورکمان و (آق قونیلو)ی سوننەی تورکمان، کە دەیانویست بەرەو ناوچەکانی دەسەلاّتی عوسمانی لە باکووری دۆڵی دوو رووبارەکەدا بکشێن. عوسمانییەکان هەوڵیاندا هەستی مەزهەبی لای سەرکردەکانی (اق قوینلو) بەکاربێنن، بۆیە

ئەم دۆخە پسپۆری بەریتانی لە کاروباری کوردیدا لە عیراق (ج. س. إدمونس — J. C. Edmonds) بەمجۆرە ئاماژەی پێدەکات (کەرکوك لە سەردەمی هەژدەی زایینی مەڵبەندی ئەیالەتی شارەزوری عوسمانی پێکدەهێنا، کە کەرکوك و هەولێر و سلێمانی دەگرتەوە هەر لە ساڵی ۱۸۹٦ ز تا ساڵی ۱۸۷۲ ز ناوی شارەزوور بەسەر سەنجەقی کەرکووکەوە چەسپێنرا کە هەولێریشی دەگرتەوە. بەڵام ولایەتی موسڵ ساڵی ۱۸۷۹ ز پەیدا بوو کەرکوکیش مەڵبەندێکی سەرەکیی بوو، کە عوسمانییەکان هەندێ دەس و پێوەند و نۆکەر و جەندرمەی خۆیان تێیدا نیشتەجێ کرد.

کاتێ کە ساڵی ۱۹۱۸ ز گەڕانەوە کەرکووك کەنیسەکەیان کردە کۆگای پاراستن و هەڵگرتنی زەخیرە و چەك و تفاق، بەڵام دوایی و پێش ئەوەی لێی بکشێنەوە بە

---

و لە بەرامبەر ئەمەدا شاە ئیسماعیلی سەفەوی بە هێزی قزلباش ساڵی ۱٥۲۹ ز پاشماوەی (اق قوینلو)ی لە تەبریز دەرکرد و کەوتە دوایان تا ناوچەکانی ڕۆژئاوای دیاربەکر و مرعش، پاشان ڕووی کردە موسڵ و لەوێشەوە بۆ شارەزوور بە مەبەستی داگیرکردنی بەغدا، لە ماوەی ئەم هێرشەدا ساڵی ۱٥۱۱ ز هەندێ لەوانەی لەگەڵ شای سەفەویدا هاتبوون لە هۆزەکانی قزلباشی شیعەی تورکمان لە ناوەڕاستی ئاسیادا نیشتەجێ بوون، کە پاشان خان یاووز سەلیم چل هەزار کەسی لێ لەناودان و ئەوانەی مانەوە لە گوندەکانی ڕێی کەرکوك بەغدا بڵاوبوونەوە.

یاووز سەلیم کە بەسەر دوژمنەکەیدا ئیسماعیلی سەفەوی (ساڵی ۱٥۱٤ ز) سەرکەوت ڕێیدا بە (۷٥) هەزار تورکمانی (اق قوینلو) کە بە نازناوی (بوز اولوس —ئەسمەر ڕەنگ-) ناوبانگیان دەکردبوو لە شارەزوور و باکووری سوریادا نشتەجێ بن.

بۆ زانیاری زیاتر سەربارەت بەم باتە بگەڕێرەوە بۆ

David Mc Dowall, A Modern History of the Kurds, London 1996. PP. 25-26.

بەمجۆرە بارودۆخی نیشتەجێ بوونی هۆزە دەوارنشینە تورکمانەکان لە کوردستاندا لە سەدەی چواردەی زایینیدا، بە زۆری دەگەڕێتەوە بۆ چاوتێبڕینی ئابووری و شەخسی و پاشان سیاسیی سەرکردەکانیان، ئەمەش وەك ئەوەی چەند هۆزێکی کوردی وایە کە شا عەباسی سەفەوی لە سەدەی شازدەی زایینیدا ناچاری کردن و بۆ هەمان مەبەست لە تورکمانستاندا بژین. لەسەر بنەمای ئەم واقیعە مەسەلەی نەتەوەیی کورد لە تورکمانستان پەیدا نەبوو، بەڵکو لە وڵاتی خۆیاندا پەیدابوو، ئەمەش ڕێك وەك هی تورکمانەکان کە دەبێ لە ناوەڕاستی ئاسیادا گەشەی کردبێ نەك لە باشووری کوردستان.

پەیکەری میرێکی (فرثي) لەسەدەی دووی پێش زاینی مۆزەخانەی تاران

تەواوی وێرانیان کرد[٤٣]. شایانی ئاماژە پێکردنە کە عوسمانییەکان چەند تیرەیەێکیان لە هۆزی شێخ بزێنیی کورد کە لە ناوچەی شواندا لە باکووری کەرکووك نیشتەجێ بوون، لە شوێنی خۆیان هەڵکەند و گواستنیانەوە بۆ ناوچەی قونیە و باشووری ئەنقەرە لە ناوەڕاستی ئەنەدۆڵ کە تائێستا بە شێوە زاری کەرکووك و دەوروبەری قسە دەکەن، هەروەها چەند هەزارێکیشیان لە هەمەوەندەکان گواستەوە بۆ ناوچەی ماردین و ئورفە لە باشووری ئەنەدۆڵ و لەوێ نیشتەجێیان کردن، جگە لەوانەی ڕەوانەی لیبیا و جەزائیر کران.

بەهەر حاڵ یەکێك لە ڕۆشنبیرە عوسمانییە ناسراوەکان وەك مامۆستا (شمس الدین سامی) پێش ئەدمۆنس، لەبەرگی پێنجەمی (قاموس الاعلام) کە ساڵی ١٣١٥ ك/١٨٩٥ ز چاپکراوە بەجۆرە بارودۆخی کەرکووك زۆر بە وردی و بە ئینسافەوە باس دەکا.

(کەرکووك شارێکە لە ولایەتی موسل لە کوردستان و بە دووری ١٦٠ کم دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری موسڵ و لە ناوەندی کۆمەڵە گردێکی زەرد و لەسەر شیوێکی (أدهم*) و مەڵبەندی سەنجەقی شارەزوور

(43) J. C. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs. Politics, Travel and Recirds in North Eastern Iraq 1919, London 1957, P. 265 ff.

* بۆ وشەی –ادهم- لە ((المعجم الوسيط))دا بە دوو مانا لێکدراوەتەوە لە ل ٣٠ کە هیچیان بۆ ئێرە ناشێن. بۆیە وەك خۆی هێشتمەوە.

پێکدەهێنن. ژمارەی دانیشتووانی (٣٠٠٠٠) کەسە و قەڵایەکی تێدایە لەگەڵ (٣٦) مزگەوت و (٧) قوتابخانە و (١٥) تەکیە و (زاویە) و (١١٢) خان و (١٢٨٢) کۆگا و دووکان و یەك دەبستان بۆ منداڵان و (٣) کەنیسە و یەك (حاورە لەوانەیە حارە بێ واتە گەرەك) لە قەڵایەکەیدا کە لەسەر گردێ بنیات نراوە و لە گەڕەك و کۆڵانەکانیشیدا کە شارەکە پێك دەهێنن و دەکەونە بەری راستی رووبارەکە، ٣/٤ی دانیشتووانی کوردن و ئەوانی دیکە تورك و عەرەب و هی تریش. هەروەها (٧٦٠) بنەماڵەی جولەکە و (٤٦٠) بنەماڵەی مەسیحی کلدانیشی تێیدایە.... هتد)[٤٤] دوای چارەکە سەدەیەك دەیێك س. ج ادمونس C. G. Edmands زانیاریی وردی دیکەی لەبارەی کەرکوك و بنەماڵە بەناوبانگەکانی دەنووسێ و ئاماژە بەوە دەکا کە (ئەم شارە بوو بە بەشێك لە دەسەڵاتی عوسمانی، پێش ئەوەی تووشی جەنگ بێ لەگەڵ هەریەك لە شا عەباس (١٦٢٥-١٦٣٠ ز) و نادرشاە (١٧٤٣-١٧٤٥ ز).

کە بەریتانییەکانیش لە ساڵی ١٩١٨ ز داگیریان کرد ژمارەی دانیشتووانی شارەکە (٢٥) هەزار کەس بوو –وەك ئەو دەڵێ–.

جگە لەوەش شاری کەرکوك بە قەزا و ناحیە و گوندی کوردنشین دەورە دراوە کە هەر یەکێك لەوانە لەگەڵ شارەکەدا مەڵبەندێکی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و بازاڕی فرۆشتنی کاڵا و بەرهەمی کێڵگەی هۆزەکانی داودە و تاڵەبانی و کاکەیی و رۆژبەیانی و شێخانی و جەباری و جاف و زەنگەنە و گل و شوان، پێکدەهێنن و هەر هەمووشیان لە دەوروبەری کەرکووکدا نیشتەجێ بوون، کە چی ئەدمۆنس دەڵێ (زۆربەی دانیشتووانی ناوشاری کەرکوك تورکمانن)، ئەگەرچی دانیش بەوەدا دەنێ

---

(٤٤) دەقەکە لە (قاموس الاعلام)دا وەك ئێمە لە ساڵی ١٩٧٧ لە کتێبخانەی (لیدن)ی سەر بە حکومەتی هۆڵەندا لێمان کۆڵیەوە بەمجۆرەیە ((کەرکوك کوردستانك موصل ولایتندە و موصلك ١٦٠ کیلومەتر جنوب شرقیسندە و برصرە تبلرك ألتندە أولە روق واسع بر أووەنك کنارندە و (وادی أدهم) أوزرندە شهرزور سنجاغتك مرکزی بر شهر أولوب، ٣٠٠٠٠ أهالیسی، قلعە سی، ٣٦ جامع و مسجدی، ٧ مدرسەسی، ١٥ تکیە و زاویەسی، ١٢ خانی، ١٢٨٢ مغازە و دکانی، بدستانی، ٨ حمامی، نهرك أوزرندە برکو بربسی، بریە رشید و ١٨ صبیان مکتبی، ٣ کلیساسی و بر حاورەسی واردر. بر تبەنك أوزرندە بولنان قلعە دروبی إیلە قلعە نك التندەکی محلاتەت و نهرك صاغ طرفندەکی قسمندن مرکب اولدینی حالدە، أهالیسینك أوج روبعی کورد و قصوری ترك و عرب و سانرەدر، ٧٦٠ إسرائیلی و ٤٦٠ کلدانی دخی واردر... هتد.

که بنەماڵە دیارەکانی تورکمان وەك (نفطجی زادە) و (یعقوبی زادە) بەرەگەز دەچنەوە سەر هۆزی زەنگەنەی کورد وەك ئەو بنەماڵانە خۆشیان دەڵێن.

لە واقیعیشدا بە تورکمان کردنی کورد لەناو شاری کەرکوك دەگەڕێتەوە بۆ چەن هۆیەك لەوانە:

١- کاریگەریی دەسەڵاتی سەربازی و سیاسی و ئیداری و رۆشنبیری تورکی لەو شارەدا، لە سەدەی شازدەی زایینییەوە.

٢- دەرکەوتنی چینێك لە سەرمایەدار لەناو تورکمانەکاندا، لە ئەنجامی (استغلال) کردنی سامانی گیانەوەر و کشتوکاڵی گوندنشینە کوردەکان لەناو بازاڕەکانی شاردا و بەشداریکردنی هەندێ لە چینە ژێردەستەکانی کوردیش لە بەرگری کردن لە بەرژەوەندی ئەوان.

٣- زاڵ بوونی زمانی تورکی وەك زمانی چینی ئەریستوکراتی بەسەر زمانی بازاڕی ناوخۆییدا لە سەردەمی عوسمانیدا.

٤- هەوڵی ئەو بنەماڵە کوردە سوننییانەی لە کوردستانی رۆژهەڵاتەوە (ئێران) هاتبوون و بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئەوان رەعیەتی دەوڵەتی عوسمانی بوون، تاکو بتوانن دوای دروستکردنی شانشینی عیراق رەگەزنامە وەربگرن.

٥- لە رێی تێکەڵبوونی کۆمەلایەتی و ژن و ژن خوازییەوە.

٦- ترس لە گەڕانەوە بۆ سەر دەسەڵاتی تورکی، چونکە تورکیا داوای ولایەتی موسڵی دەکرد. لە کۆتاییشدا دەبێ ئاماژە بەوە بکرێ کە دیاردەی بە تورکمان کردن لە چوارچێوە سروشتییەکەی خۆیدا و لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، جگە لە کورد، هەندێ خێزانی عەرەبیشی گرتەوە کە پیشەی گۆشت فرۆشییان دەکرد لە شاری کەرکوك.

ئەم چەمکە بە گشتی مانای جێگیربوونی دەگرتەوە لەم شارەدا، کە لە قوتابخانە و بازاڕەکانیدا و لە سەردەمی عوسمانییەوە زمانی تورکی زاڵ بوو. لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی ناوبراوەوە و لە دوای پێکهێنانی پەیمانی بەغدا و کردنەوەی مەڵبەندی رۆشنبیری تورکی لە شارەکەدا، ئەم دیاردەیە —تورکمان کردن— توندتر بوو.

بەڵام سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ ز ئەم دیاردەی بە تورکمان کردنەی گۆڕی بەتایبەتی دوای ئەوەی لە دەستووری کاتیدا دان بەوەنرا کە کورد و عەرەب هاوبەشن لە نیشتیمانی عیراقیدا، ئەمە جگە لەوە ی دەرچوونی عیراق لە پەیمانی بەغدا، ئەوانەی شانازییان بەو دیاردەیەوە دەکرد و پشتگیری نزیك بوونەوەی سیاسی نێوان عیراق و تورکیایان دەکرد، زۆر توڕە و پەست کرد.

هەندێ کەس ئەو دەقەیان (کورد و عەرەب هاوبەشن) بە گورزێکی بە ئێش و ئازار لە قەڵەمدا کە وەبەر هەستی زاڵبوونی رەگەز و شارستانیەتی ئەوان کەوت، چونکە وایان دەزانی دەوڵەت ئەوانی پشت گوێ خست و ئەو توێژە جوتیاری و خێڵەکیە کورد و عەرەبە ئاست نزمانەی —بە بۆچوونی ئەوان- کرد بە شەرێك لە مۆلکایەتی نیشتیمانێکدا کە عوسمانییەکان بۆ زیاتر لە پێنج سەدە بەسەریدا زاڵ بوون.

ئەم جۆرە بیرکردنەوە و راڤە کردنەی واقیع و ئەو کاردانەوەش کە رووبەڕووی بووەوە بووە هۆی گۆڕینی پێکهاتەی زەینی —البنیة الذهنیة- دانیشتووانی شارەکە، دوای ئەوەش کە چوونە ناو کۆمەڵی حیزب و رێکخراوی دژ بەیەك، ئەنجامە نەرێتییەکانی —سلبی- ئەم بارودۆخە هەلێکی زێڕینی رەخساند تاکو لە لایەن هێزە دەرەکییەکانەوە کەلکی لێ وەربگیرێ و —استغلال- بکرێ.

مافی هاوولاتی بوونی مرۆڤ و توانەوە لە چوارچێوەی (بوتقە) رۆشنبیرییەك لە رۆشنبیرییەکان نەبەستراوەتە بە درێژی پشتێنەی مێژوویی بوونی ئەو نەتەوەیە لەم وڵات یان ئەو وڵاتەدا، بەڵام ئەمە مانای ئەوەنییە راستیی ئەو جیاوازییەی کە پێشینەی زمانەوانی و رۆشنبیری توێژەکانی کۆمەڵگەیەك وەك کۆمەڵگەی کەرکووك پێکدەهێنن پشتگوێ بخرێ و نینکار بکرێ.

عەرەبی وەك دەزانین لە نیمچە دورگەی عەرەبدا پەیدا بوو، پاشان پاشماوەی زمانە سامیەکان وەك کەنعانی و بابلی و ئارامی لە سوریا و عیراق لەخۆ گرت. بەڵام زمانی کوردی لە باکوور و رۆژهەڵاتی دۆڵی دوو رووبارەکەدا دەرکەوت و پەیدا بوو، ئەمەش لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی هیندییە —ئارییەکان و ئێرانییە کۆنەکان بوو لە نێوان دانیشتووانی ناوچە بەرزەکاندا لە کوتییەکان و حورییەکان. رەگی تورکمانیش دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵە زمانی ئۆڕال —ئەلتای کە لە ناوەڕاستی ئاسیا بڵاوبووەوە.

سەرەڕای ئەم واقیعە مێژووییە ئێمە دەتوانین وزەی هزری و جەستەیی خۆمان —طاقاتنا الفکریة و العقلیة- بەکاربهێنن بۆ گۆڕینی ئەم جیاوازییە زمانەوانی و رۆشنبیرییە بەرەو پێکهاتنی بنەمایەك بۆ سەرکەوتنی زەینی —التوافق الذهنی- لای کەرکووکییەکان، هەروەها دەکرێ ئەو سەرکەوتنە زەینییە رێکبخرێ بۆ کەڵك وەرگرتن لە دەرامەت و سامانی سروشتی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بۆ هەموو دانیشتووان لە شوێنی نیشتەجێ بوونیاندا و لەپێناو گەشەکردنی بارودۆخی مرۆڤ لە عیراقدا و دابین کردنی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیرییان.